سابیر ڕەشید

# کتێبفرۆش



ڕۆمان



* ناوی کتێب: کتێبفرۆش
* نووسەر: سابیر ڕەشید
* بابەت: ڕۆمان
* وێنەی بەرگ: هونەرمەند عەزیز پیرداود
* دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆك: جەوهەر فەتاح
* ڕێنووس و زمانەوانی: کامەران تاهیر
* پیتچنین: کاوە حوسێن
* تیراژ: ١٠٠٠ دانە
* چاپخانە: تاران
* چاپی یەکەم – ٢٠٢٠
* نرخ: ٢٠٠٠ دینار
* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (٤٠٤)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێدراوە.

(١)

ئومێد، ئەو ڕۆژەی لە سەربان وێستا بوو، ئازارێکی بێ ئامان خەریکبوو بەنێو سەرتاپای لەشیدا شۆڕدەبووەوە، پێی وابوو ئیدی ژیان، ئەو بەهایەی نەماوە، تاوەکوو خۆتی پێیەوە شۆڕبکەیتەوە، بۆیە وا لە هزران ڕۆچوو، دەرووێکی بۆ دەربازبوون لە کول و کۆڤان و ئازارەکانی دۆزیوەتەوە، چی دیکە ڕێ نادات، خەم پرووزەی لەبەر ببڕێت و ئازار و مەراق بەردەوام دەستیان لە بینەقاقای گیر بکەن و هەناسەی لەبەر ببڕن.

بیری لای ئەوەبوو مرۆڤ چۆن بە هەموو توان و تاسەی ژیان، بەرەو ڕووی مردن دەبێتەوە، کە ئومێدبڕاویش دەبێت، ئاوا بە تاسەی مردن، بەرەو ڕووی ژیان دەبێتەوە، بەڵام کەی؟ بێگومان ئەو دەمەی ژیان دەبێتە دۆزەخێکی کپ و نادیار، گومان یاخۆ لایەنی کەم، ئەو ڕاستییە ڕوونەی تەنها بۆ پشتتێکردنی دەیکەیە گومان، وەک گورگێکی برسی هەناوت دەخوات،

ئەوێ ڕۆژێی بە بیران هاتەوە، کە لە خاڵی پشکنینی نێوان کەرکووک و هەولێردا، دوای ئەوەی بارگە و بوخچەیان پشکنی، لەناو کتێبەکانی لە بەغدای هێنابوون، چەند کتێبێکی، گوایە قەدەخەیان، دۆزیبووەوە، لە ترومبێلەکەیان هێنابووە خوارێ، بە دەستی کەلەپچەکراو و چاوی بەستراوەوە، بەپێشەخۆیان دابوو. ئێستە، پێی وایە مرۆڤ گاوی بیرکردنەوەکانی هەڵەیە، چونکە ئەو دەمای، کە بە ئومێدی تیرێژێکی ڕووناکی بوو، هیوای ژیانی دەخواست، کەچی ئێستە خەریکە تەپڵەسەری تاوسووت دەبێت، ئەو حەزی لە مردنە. لەوێندەر لەو دیوار و شووورای باستیلەکانی تەنیا دڕندەیی تێدا دەسەڵاتداربوون، قامچییەکان وەک ئاگر بەر جەستەی دەکەوتن و گۆشتەوزوونی برینان قەڵغانی بەرگری و خۆڕاگرتنیان بەهێزتر دەکرد. کەچی لێرە، لە دەرەوەی ئەو قەڵا سەختە، ئەو قامچییە مانەوییانەی هەڵدەبڕدرێن، ڕێک لەگەڵ داهێنانەوەیان بەر گیانی دەکەون. خەریکبوو پڕ بە گەرووی نا، تژی بە بوونی خۆی هاوار بکات: «ئاخر بۆ؟!..... خاتوون بۆ؟!»، بەڵام، نەوەکا شار لێی وا ئەگا بێت و ئاوڕێکی بەسەردا بدەنەوە، وا تێبگەن ئێستەش هەر ئەو زارۆکە لاواز و بنێس و دوورەپەرێزمیە، کە پێشتر مەزەندەیان کردبوو، نەیاندەزانی ئەو مرۆڤێکی

بەخشندە و لەخۆبووردووی لە ناخیدایە، نەک کەسێکی لاواز و بنێس.
ئەو هەر لە منداڵییەوە وابوو، هێندە تێکەڵی زارۆکانی گەڕەک نەدەبوو، هەمیشە هەستی دەکرد ئەوان لەو جیان، یان لەبەرئەوەی بوو، کە تا گەیشتبووە پێنج شەش ساڵان چەند گەڕەکیان کردبوو، یاخۆ بە جەستە خۆی لەوانی دی لاوازتر دەهاتە بەرچاو. بەهەرحاڵ، حەزی لە هاروهاجییەکەیان نەبوو، پتر بە لای شەرم و فەدی و هێمنی و ئارامیدا بوو. جارجارە تێکەڵی یارییەکانیان دەبوو، لێ وەک ئەوەی خودا بۆ ئەو گەمانەی چێ نەکردبێت، هەردەم دەبووە جێی گلە و گازاندەی ئەوانی دی، مەگەر دەستەی یارییان تەواو نەبووایە، دەنا بە هەوانتە پێکیان نەدەکرد، زۆر جارانیش شەڕیان پێدەفرۆشت بە دڵێکی بەخەم و چاو تژی لە ڕۆندکان بە بێدەنگی دەخزایە، کونجی ماڵ. جا ئەگەر دایبابی بیاندیتبا دەگری، سەریان دەخستەسەری تا بڵێت کێ لێی داوە، کە دەچوونە سەر زارۆکانیش، هەر کەسە و پەرێزی خۆی پاکژ دەکردەوە و کەس نەیدەگوت کێ گڕنەی تێهاڵاندووە.
دایبابی دەیانزانی ناکرێت منداڵێک لە ماڵەوە بەندبکەیت و نەهێڵیت تێکەڵی زارۆکانی دی

ببێت، بەڵام لەبەر کەمدوویی و دوورەپەرێزی، نەک هەر منداڵەکانی گەڕەک، بگرە گەورانیش ناویان لێنابوو فەقیرۆکە. بۆیە بەردەوام خۆی لە گێچەڵی منداڵە لاسار و بزێوەکان دەپاراست و لێیان دەسڵەمییەوە، لە پەراوێزی وازی و گاڵتە و بەزمەکانیان دەژیا.

زۆر جاران لە گەڕەکدا، کە پێکیان نەدەکرد، دەهاتە دیارییان و کاتی خۆی بە تەماشاکردنی و یارییەکانییان بەسەردەبرد، بۆیە کە گەورەش بوو دوورەپەرێز بوو، لێ ڕاستە وەك دەبێژن مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، بۆیە تا لە دەستی تەنیایی هەڵبێت، لە هەوڵی ئەوەیدایە هاوەڵێک بۆ خۆی پەیدا بکات، زۆر جاران بووکەڵەیەک دەکاتە برادەر و هاودەمی خۆی، تەنانەت گلە و گازاندەشی لە کن دەکات، خەمی دڵی خۆیشی لە لادا هەڵدەڕێژێت، ئومێد لەگەڵ ئەو کڕ و کپییەی، لە نادیاری دوو چاوی زیتی هەبوو، سەرومڕ بە دەوروبەر و دونیای خەیاڵیدا دەگێڕان، هێندەشی نەبرد هاوەڵێکی بۆ خۆی دۆزییەوە، خەریک بوو شەو و ڕۆژی لەگەڵدا بەسەر دەبرد.

١

گەڕەکەکانی شار، بە تایبەتیش هەژارنشینەکان،

هەردەم دووکان و بازاڕێکی چکۆڵەیان هەبوو. چەند دووکانێکیش هێوەی ماڵەکەی ئەوان بوون، بەردەوام هاتوچۆیان بەسەرەوە بوو. سەید عەزیزی دووکاندار هاوینان بەفری دەفرۆشت، هەرکە دونیاش فێنک دادەهاتەوە و وەرز دەگۆڕا، دەیکردەوە شەکەرات و وردەواڵە. ئەگەر سەید بە یایلی بەفری بگێڕابا، ئەوا سەید حەسەنی کوڕی لەسەر دووکانێ ڕۆدەنیشت، ئەو کوڕە برادەری شێرزادی ئامۆزای ئومێدی بوو، شێرزادیش، هەفتەی سێ ڕۆژ نەهاتبایە سەردانی، دوو ڕۆژان هەر دەهات، جارجارەش خۆی بە ماڵی مامیدا دەکرد و چایەکی بە دیشلەمەی لەوێش دەخواردەوە، ئومێد ئەگەرچی لەوانیش منداڵتربوو، بەڵام بەسای ئامۆزایەکەی لەگەڵ کوڕەکەی سەید عەزیزی بووبووە ئاشنا. ئەو دەیزانی شێرزاد مەتووی خوێندنەومیە و کتێبیش بۆ کوڕەکەی سەید عەزیز و یەک دوو برادەری دیکەی دەبات، دوای خوێندنەوە لێیان وەردەگرێتەوە. دەمەو ئێوارەیەك، کە شێرزاد لایدابووە ماڵێیان و خەریکی چاخواردنەوەبوو، لە دەرگەی حەوشە درا، دوو جەوان بوون و لە شێرزادیان دەپرسی و سەر و کتێبیان بۆ هێنابوومەوە. کتێبەکانی لێ وەرگرتنەوە و بردییەوە ژووری، بە تاسەوە بە شێرزادی گوت دەکرێت بیانخوێنێتەوە. شێرزادیش نەک هەر ڕازی بوو، بگرە

زۆریشی پێ خۆشبوو.

لەو ڕۆژیڕا، ئومێدیش چووە ڕیزێ، ئەویش بەشی خۆی کتێبانی وەردەگرت و دەیخوێندەوە و دەیدایەوە شیرزاد، شێرزادیش بە کتێبی ئاسان وردە وردە، لە فڕی فڕی قەڵ فڕی و حیکایەتی دز و قازی و بۆ پێکەنین و ڕشتەی مرواری و حیکایەتی زادیچ و مەلای مەشهور، سەرهات و چیرۆکان، بێ ئەوەی هێندەی لێ حاڵی ببن، دیوانی شاعیرە کلاسیکییەکانیشی بۆ دەهێنان. ئەوەی دواییێیان ئومێدی بە لای شیعردا کێڵکردەوە، دەفتەرێکی پڕ شیعرکردبوو، خۆی لێ بووبووە گەورەترین شاعیر، ڤێجا کە پتر چووە نێو دونیای خوێندنەوە و شارەزاییەکی سەرەتایی لە ڕەوتی شیعری کوردی و شیعری جیهانی پەیداکرد، ئیدی دەفتەرە شڕەی سەرنگووم کرد و هەر باسیشی نەکردەوە. تا وردە وردە کتێبی مێژوویی و شیعری نوێ و کتێبی جۆراجۆری دیکەیان دەخوێندەوە، بە تایبەت حەزی لە کولتووری گەلان بوو، ئاخر ئەو ئێستە ناوی ئەو هزرڤانەی لە بیر نییە کە دبێژێت: ئەگەر مێژووی مرۆڤ لە بەرژەوەندیی چینی دەسەڵاتدار نووسرابێتەوە، ئەوا دەبێت لە کەلەپووری گەلان منەی ڕاستییەکان بکەین، لێ دەستی لە شیعر نووسین هەر بەرنەدەبوو. سەرەتا لاسایی تەوژمە

باوەکەی دەکردەوە، بە شیعری نوێ کاریگەر و سەرسام بوو، چەند شیعرێکیشی لە ڕۆژنامە و گۆڤاراندا هاتە وەشان، بە ئومێد ڕەشپۆش ناسرا، زۆر جاران، کە جلەوی بۆ ئەندێشە شل دەکرد، خۆی لە ڕیزی ناوداران دەبینییەوە
تۆبڵێی ئەو ڕەشپۆشییەی، بێ ئەوەی ئاماژەیەکی ئاشکرای پێوە دیار بێت، چارەنووسی ئەو نەبووبێت یاخۆ لە چارەی نووسرا بێت؟! ئاخر ئەو، بەر لە ژنهێنانیش هەر ڕەشپۆشبوو، خەمێکی نادیاری قورس و گران وەک هەڵمی قورقووشم لەودیوی ڕۆحییەوە تەمی دەکرد، کە خاتوونیش دەستبەرداری بوو، پێی وابوو ئەو کارەساتەی پێشتر لە غەیبەوە دیتووە، لەو بڕوایە دابوو ئەو ڕەشپۆشییەشی لە ئەزەلەوە دەقەبەڵ کراوە.

ئەو تا ئەم چرکەساتەش، کە خەریکە لە داخ و کۆڤانان و کردەوەی خاتوون بە خەرمەندی ژیانیدا دەدات، ئیدی نایەوێت بێ ئەو بژیت، دەیویست لە هەموو یادەوەرییە خۆش و ناخۆشەکانی دابڕێت، کەچی لەگەڵ هەر جووڵەیەکیدا ئەو یادەوەرییانە بە پێش چاویدا گوزەریان دەکرد و پتر گوشاری دەروونی هورووژمی بۆ دەهێنا.

یەکەمین چرکەساتی ڤینی لەگەڵ خاتوون دەهاتەوە پێش چاوان، یەکەمین جار لە یانەی شەوانەی ئاسیاوی سوور، لە تەنیشت مێزەکەی وی دانیشت، دوای ئەوەی چەند جارێکی دیکە یەکدییان بینی، نهێنیی دڵی خۆی لای خاتوون درکاند. لە بیریەتی چۆن ژنە دەستەکانی شلبوون و جەستەی خاوبووەوە، ئەگەر دەستەکانی، کە لەناو دەستی ئەودا بوون، توند نەگرتایە، ڕەنگە ژنە بە کورسییەوە بەپشتدا قەلار ببووایەوە. ئاخر چۆنی باوەڕ بکردایە، بێ ئەوەی پەرجووێک لە ئاردا بێت، کەسێک لە ڕووسپیخانەیەک باسی ڤانێکی پاک و بێگەردی بۆ بکات، بەڵام نا، زۆر جاران گەوهەری بە نرخ لەناو قوڕ و لیتە و گوفەکاندا دەدۆزرێتەوە، دوای ماوەیەک لە ڤان و ڤین، هەر گاوێك کە ئومێد ڕەشپۆش بۆ کتێب کڕین دەچووە بەغدا ، ئەو چەند ڕۆژەی لەوێندەر دەمایەوە سەردانی یانەی شەوانەی ئاسیاوی سووری دەکرد، کە لە شا شەقامە سەرەکییەکەی پایتەختدا بوو.

ئومێد بە ڕۆژ منەی کتێبانی دەکرد، شەوانیش دەچووە یانە و چاوی دەگێڕا تاکوو خاتوون ببینێت، هەر بەر چاوی نەکەوتایە، ئیدی ئۆقرەی نەدەگرت، بۆ ئەوەی چاوەڕێ بکات، یەکسەر لە سۆراخی دەپرسی،

بۆیە هێندەی پێنەدەچوو خاتوون بە لەنجە و لار لە تەنیشت مێزەکەیدا ڕۆدەنیشت، هەم بە مەی مەست دەبوو، هەمیش بە دیتنی خاتوون، دوای خۆشەویستیی خاتوونیش، هەرچەندە پێشتر نازناوی ڕەشپۆش بوو، کە جاران ڕەشپۆشییەکەی بۆ کوردستان بوو، کە شەیدای سەربەخۆیی بوو، ڤێجا خاتوونیش بە تەواوی حەزی بەم نازناوە دەکرد، چونکە خاتوون حەزی لە جلکی ڕەش دەکرد، بۆیە لە خۆشەویستیی وێ سەرومڕ کراس و پانتۆڵ و قاتی ڕەشی دەپۆشی و زۆریشی کەیف پێدەهات.

* * *

ئومێد لەو چرکەساتەدا، کە لە سەربان وێستابوو، هەستی دەکرد زەوی گازی دەکات، ئەو هێشتە خاتوونی خۆشدەویست، لێ هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرد ئەوینەکەیان بەو مەرەدە ببات، نەک هەر کارێکی ئاوای لێ بوەشێتەوە، بگرە گومانێکی ئاواشی لا چێ بکات. ئاخر لە هەمبەر ئەو ئازارەی، تۆڵە لە کێ بکاتەوە؟! لە خاتوون، کە ئێستەش کڵپەیەکی شیرینی دڵ و دەروونییەتی، یاخۆ کەسێکی وەک تارمایی و تاپۆیەکی نادیار بە گوێیدا دەچرپێنن؟! نا.... ئەو دەستی ناچێتە ئازاردانی مارێکیش.

ئومێد، خۆی و خاتوونی وا دەهاتە بەر چاوان دوو داری زڕ بن و لە عاردێکی ڕەقەن ڕوا بن، تەنانەت ئەو چێژ و سۆزەی پێشتر لک و چڵەکانی دەگەیاندنە ئێستە، وشکبووە و بووەتە چڵوچێو. زۆر کەم یەکدییان دەدواند، ئومێد نەک خۆی لە نیگای ئەو دەبوارد، بگرە خۆی لە نیگای دەرودراوسێ و خەڵکی گەڕەکیش دەبوارد. ئاخر ئەوان زۆر جاران بە چاو، بە قسە سووسەی هەندێک شتانیان بۆ کردبوو. باسی ئەو کوڕەیان بۆ کردبوو، گوایە خزمیەتی و سەردانیشیان دەکات. کەچی خاتوون گوتبووی ئێستە هێندە نکارم بەرو بازار بکەم، ئەو کوڕە بازاڕیمان بۆ دەکات و پێداویستییەکانمان بۆ دێنێتە بەردەرگە

و دەگەڕێتەوە. ئومێدیش دەیویست باوەڕ بە قسەکانی خاتوون بکات، لێ نیگای نەشتەری خەڵکی گەڕەک بۆ ئاقارێکی دیکەیان ڕاودەنا. ئاقارێک زەوییەکەی سیخناخ لە کرمی گومان یاخۆ وەک ئەژدیهایەک سەریان لە هەناوی نابوو.

خاتوون کەسوکاری نەمابوو، هی ئەو شارەش نەبوو، بۆیە لە ئومێد زیاتر کەسی دیکەی نەبوو لێی بپێچێتەوە، ئەویش دەیزانی و خەڵکی گەڕەکیش پێیان گوتبوو گەنجێکی نامۆ بە گەڕەك هاتوچووی ماڵیان دەکات، خۆشی دانی بەوەدا نابوو، بۆیە ئەو کەسەی هەڵبژاردووە، چونکە ئومێد هەم پیاوەتی نەماوە، هەمیش سەروەڕ لە ماڵەوە خەریکی خوێندنەوە و شیعرنووسینە، بە ڕۆژیش لەبەر کتێبفرۆشیی ئاگای لە خاتوون نەماوە، لەو ماڵەدا وەك دوو جەمسەری جیاوازن، تەنها کونجی خانوویەك بە یەکدییەوەیان دەبەستێتەوە.

هیچ منداڵیشیان نەبوو تا ماڵەکەیان ئاوەدان بێتەوە، هەرچەندە سەردانی دەیان دکتۆری بەناوبانگی هەولێر و بەغداشیان کردبوو، هۆکاری منداڵ نەبوونەکە زانرا، کە خاتوونە، ئیدی ئومێد وازی لێ هێنا و بیری نەوە خستنەوەی لە مێشکی خۆیدا سڕییەوە.

هەموو جار کە خزمانی ئومێد، یان دراوسێیەکانی

ئەو بابەتەیان لەگەڵدا دەکردەوە، ئەو دەستی بۆ کتێبان دەبرد و دەیوت:
- ئەدی ئەوانە چین، ئەدی ئەو کتێبانە هەموو منداڵی من نین.
ئومێد یەکەمین جار، کە بە نەمانی مەیلی خۆشەویستی خاتوونی زانی، بۆ ئەو لە هۆکارەکەی پرسی، ئەویش بەرسڤی دایەوە و گوتی:
- هۆکار تۆیت، پیاوەتیت نەماوە، ناشتوانیت بۆ من بژیت و کاتم بۆ تەرخان بکەیت و لەناو بیر و هزری تۆدا نەماوم، تۆ پیاوێکی خۆپەرستی، ڕاستە تۆ منت خۆش ویستووە و بە خۆشەویستییەوە ئەم ماڵەمان پێکەوە ناوە، دەشزانم ئێستەش هەر خۆشەویستی منت فڕێ نەداوە، لێ منیش خۆشمویستی و دەبووایە تۆزێك کاتی خۆتم پێ بدەیت، ئیدی کتێبان خۆشەویستی تۆن، منیش غەوارە، منیش مرۆڤم و پێویستیم بە سۆز و ئەوین هەیە.
گریمان لە ڕووی جەستەوە من توانیم حەزی خۆم بمرێنم، ئەدی کوا مافی خۆشەویستی من، ئەوەتانێ چەندان ساڵە من لە نێوان چوار دیوار و بنمیچ و ژوورەکانی ئەم خانووەدا، وەك زیندانییەك وام، تەنیا کاتەکانی ژیان بەڕێ دەکەم، هەمووی هەڵەی تۆیە، تۆ بوویت خۆشەویستی نێوانمانت هەرس پێهێنا.

هەرچەندە خاتوون دەیزانی نەمانی پیاوەتیی ئومێد هۆکاری هەبووە، ئەو دەمە بوو، کە لە بەغداوە دەهاتەوە هەولێر، لە پشکنینی بازگەی کەرکووکدا لەناو کتێبەکانیدا، چەندان کتێبی چەپڕۆیی و قەدەخەکراویان دۆزییەوە.
ئەوەبوو بردیان و چەند مانگێك چارەنووسی بە نادیاری کەوتە ئەمنی کەرکووك و لەوێشەوە ڕەوانەی ئەمنی بەغدا کرا، لەوێندەر لە کاتی فەلاقە و لێدان و ئازاردانی سەخت تاکوو ددان بەوەدا بنێت لە کامە شانەی چەکداری کاردەکات و نهێنی بۆ ئەوان بدرکێنێت.
ڕۆژی جارێك بە چاوی بەستراوەوە نیوە گیانیان دەکرد، بەڵام ئومێد ئازا و بە توان بوو بەرگەی گرت، پێوەندیی بە کەسێکەوە نەبوو تاکوو بیدرکێنێت، هەرچەندە وی لە هیچ ڕێکخستنێکدا نەبوو تا ناوی بدات و شانەی چەکدار و نهێنی ئاشکرا بکات، بەڵام پیاوانی ئەمن ئەوەیان نەدەزانی، جاری وا هەبوو کەسەکە هیچی لە هیچدا نەبوو، کەچی لە تاو ئازاری فەلاقە و کارەبا لێدان و بە پانکە وەکردن و بڵندکردنی بە دوو دەستی بەستراوەوە لە پشتەوە بۆ ئاسمان و هەموو جۆرە ئەشکەنجەدانێکی دیکەیش ناوی دۆست و برادەرانی خۆی دەگوت تەنیا بۆ

ئـەوەی لـە ئـازار ڕزگاری بێـت، ئەوانیـش بـێ بەزەییانـە دەکەوتنـە ویزەیـان، بـەڵام ئـەو هیـچ پێوەندییەکـی بـە ڕێکخسـتن و شـانەی چەکـداری و شۆڕشـەوە نەبـوو، تەنانـەت لایەنگـری هیـچ حیزبێـك نەبـوو، تەنیـا شـاعیر و خوێندەوارێـك بـوو، هەڵگـری بیروبـاوەڕی چەپڕۆیـی و هـزری پێشـکەوتنخواز بـوو.

ئـەو لـە هەمـوو ئازاردانێکـدا بەرگـەی گـرت، ئەوانیـش هیچیـان بـۆ نەسـەلما، تەنیـا ئەوەیـان بـۆ دەرکـەوت، کـە کتێبفرۆشـە و کتێبـی قەدەغـەی بـردووە تـا لـە هەولێـر بیفرۆشـێت، بۆیـە بەڵێننامەیـان پێـی مۆرکـرد، کـە جارێکـی دیکـە ئـەو جـۆرە کتێبانـە نەکڕێـت و نەفرۆشـێت.

فرێیاندایە دەرەوەی گرتیگەوە، هاتەوە ناو ژیانی ئاسـایی خـۆی، وەلـێ بـە هـۆی فەلاقـەی زۆر و کارەبـا لێدانـی لـە چـووك و ئەندامـی نێرینەیـدا، سـوودی سـەرجێی نەمابـوو. ئـەم ڕووداوە و گرتنـەی ئـەو، چەنـد سـاڵێك دوای هاوسـەرگیری بـوو لەگـەڵ خاتـوون، هـۆکاری منـداڵ نەبوونیشـیان، سـەرەتا خاتـوون خۆیشـی نەیدەزانـی، چونکـە ئـەو هـەر لـە منداڵییـەوە لـە ڕەوشـێکی سـەخت و دژوار و تـژی لـە ئێـش و ئـازار لەگـەڵ ناخۆشـی و چەرمەسـەرییەکاندا گـەورە بووبـوو، هەندێـك جـار خـۆی هۆکارەکـەی وەهـا لێکدەدایـەوە، کـە ئـەو بـە

دەست باوەژنەکەیەوە وای لێهاتبێت، ئەمەش ئەو کاتە بوو، کە دایکی دەمرێت و باوکی دەیخاتە بەردەم زڕدایکێك، کە هەرگیز بەزەیی پێدا نەهاتووە و بەردەوام کاری سەختی پێکردووە.

ئەو وای لێکدەدایەوە هۆکاری منداڵ نەبوونی ئەو ڕۆژە بووە کە تەواو لە گیانی خۆی بێزار بوو و ڕایکردە سەربان و خۆی فڕێداوە، لە تاو ئەوەی لەم دونیایەدا نەیتوانی پشوو بدات، بگرە هیچ نەبێت لە دونیاکەی دیکەدا بحەسێتەوە و وازی لێبێنن، بەڵام لەگەڵ ئەمەش بە مردن شادنەبووە، سێ هەیڤان لەسەر جێ، مینا مردوویێك نەیتوانی لە جێی خۆیدا بجووڵێتەوە.

خاتوون ئەمەی بە هۆکار دەزانی ڕەنگبێ لەم کەوتنەدا ئەندامی زاوزێی زیانی بەرکەوتبێت، هەر ئەمەش بێت هۆکاری منداڵ نەبوونەکەی.

لە پشکنینی دکتۆرەکانیشدا ئەنجامەکەیان بۆ هێدمە و بەرکەوتنێکی سەخت دەگەڕاندەوە، کە لە ژیانیدا بەسەری هاتبێت.

خاتوون هەردەم خەم و کۆڤانی وێ نەبوونی دایکایەتی بوو، کە بۆشاییەکی مەزن و درزێکی گەورەی خستە ژیانی هاوسەری.

* * *

ئومێد هەردوو دەستی خستە سەر چاوەکانی، بۆ ئەوەی ئامادەی خۆفرێدان بێت، لەو دەمەدا وەك برووسکە خەیاڵی بۆ ئەو شەوە گەڕایەوە، کە یەکەمین جار سەردانی یانەی ئاسیاوی سووری کرد لە شەقامی سەعدوندا، ئەو دەمەی هاتەوە بیر، کە ئافرەتێك بووە ڕوانگەی چاوەکانی و بە جوانی و شۆخ و شەنگییەکەی سەرسام بوو، هەر لەو ڕوانینەدا تیری ئەڤینێك لە دڵی گیربوو، بە گارسۆنەکە داوەتی سەر مێزی خۆی کرد، پێکەوە ڕۆنیشتن و خواردیانەوە، یەکدییان ناسی.

ئەو شەوە خاتوون، بەدەم خواردنەوە و پێکهەڵدان و وتووێژەوە دڵی خۆی بۆ ئومێد کردەوە و چیرۆکی خۆی و چۆنییەتی هاتنی بۆ یانەکە بە وردی و ڕاستگۆیی گێڕایەوە.

ئومێد بەدەم گێڕانەوەی ئەو چیرۆك و سەربردە تراجیدیانەی ئەو، وردە وردە مەستتر دەبوو، بەڵێنی پێدا هەم ببێتە هاودەمی، هەمیش ببێتە هەڵگری خەمەکانی، تەنانەت ڕزگاریشی بکات لەو گرتیکە سەختەی ژیانیدا.

خاتوون قوربانی ئەو داب و نەریتە بوو، کە ئافرەت دەبێت پێیەوە پابەند بێت و قبووڵی ئەنجامەکەشی بکات و لەگەڵیشیدا ڕابێت و متەق نەکات، چونکە

ئـەوە کۆمەڵگەیـە لەبـری هەمـووان بیـر دەکاتـەوە و بڕیاریـش دەدات، یاخـۆ ئەگـەر لایـدا ئـەوا دەبێـت مـردن هەڵبژێرێـت، چونکـە بڕیـاری ژیانـی بەدەسـت خـۆی نییـە و کەسـانی دیکـە بـۆی هەڵدەبژێـرن، یاخـۆ ئەگـەر بیەوێـت خـۆی ڕزگـار بـکات، دەبێـت ڕابـکات و ئـەم سنوورانە ببڕێـت، هـەردەم لـە شـوێنێکی دیکـەوە بـە ترسـەوە بـژی و دووربکەوێتـەوە و نەهێڵێـت بکەوێتـەوە بـەر چـاوی خەڵکەکـەی خـۆی.

خاتـوون خەڵکـی مووسـڵ بـوو، بـەڵام خەڵکـی ڕەسـەنی ئـەو شـارە نەبوون، کاتـی خـۆی لـە بەردەڕەشـەوە هاتبوونـە مووسـڵ، کەسـوکاری لەبـەر دوژمنـداری لـە شـوێنی خۆیـان نەمـان، لـە گەڕەکـی (مەیـدان)ی مووسـڵ، کـە گەڕەکێکـی هەژارنشـین بـوو خانوویەکـی دوو ژووری کـۆن بـە کـرێ دەگـرن تیایـدا دەژیـن.

باوکـی کۆڵهەڵگـر بوو، بژێوی ژیانیانـی دابیـن دەکـرد. کەمالـی بـرای تـا پلـەی ئامادەیـی خوێندبـوو، بـەڵام لەبەرئـەوەی نمـرەی باشـی نەهێنابـوو، لـە پەیمانگـەی مامۆسـتایان نـاوی دەردەچێت، دوای تەواوکردنـی خوێنـدن لە سـەربازگەی مووسـڵ دەبێتە سـەرباز، دوایی بۆ خەفاجیە ڕەوانـە دەکـرێ و دەنێردرێتـە پێشـەوەی سـەنگەرەکانی شـەڕی عێـراق و ئێـران، لـە هێرشـێکدا نـاوی شـەهیدی پێدەبڕێـت و تەرمەکـەی دەنێرنـەوە لای کەسـوکاری،

باوکی ترومبێلێکی بەرازیلی وەك خەڵاتی شەهیدانە وەردەگرێت، پاشان ماشێنەکە دەفرۆشن و لەگەڵ هەندێك پارەی دیکە، کە پاشەکەوتیان کردبوو کۆنە خانووێك، لەو گەڕەکەی خۆیان پێدەکڕن و لە کرێچیاتی ڕزگاریان دەبێت.

خاتوونیش تا پلەی سێی ناوەندی دەخوێنێت، دوای نەمانی براکەی واز لە خوێندن دەهێنێت، ئیدی خزمەتیماڵەوە دەکات.

دوای چەند ساڵێك خاتوون، بە هۆی خەم و کۆفانی لەدەستدانی براکەیەوە، دایکیشی بەزگدا دەدات و دەمرێت، بێوەژنێك کە ناوی سەعدیە بوو دەبێتە باوەژنی خاتوون.

سەعدیەی زڕدایکی ناهێڵێت خاتوون لەو ماڵەدا پشوویەك بدات، جگە لەوەی بەردەوام هەموو ئیشەکانی ماڵەوەی پێدەکات، لای باوکیشی بەردەوام گازاندەی لێدەکات، باوکیشی هەردەم بە قسەی ئەو لێی دەدات، ئیدی دەرگیری ئازاری دەروونی دەبێت.
ڕۆژێکیان خاتوون تەواو لە ژیانی خۆی بێزار دەبێت و مردن دەکاتە تاکە ڕێگە و ڕزگارکەری خۆی، ئیدی بەرگەی ئەو هەموو ئازار و ژیانە سەختەی نەگرت، بۆیە بیری بۆ ئەوە دەچێت بچێتە سەربان و خۆی بخاتە خوارەوە و تەواو، ئەم هەنگاوەشی هاوێشت

و خۆی فڕێدا و جەستەی ئازاری زۆری پێگەیشت، بەڵام مردن هاوەڵی نەبوو، سێ مانگان وەك مردوویەك لەناو جێگەدا ڕادەكشێت، تا دوایی وردە وردە دكارێت ڕابێت و بجووڵێتەوە و هەنگاو هەڵێنێت.

خاتوون، سلێمانی ئامۆزای خۆشدەویست و بەڵێنیان بە یەكدی دابوو، بەڵام جارێكی دیكەیش لەم چارەنووسەشدا سەعدیەی باوەژنی لێیان بوو بە دڕكی مەم و زین، خاتوونی بۆ كوڕە خوشكەكەی خۆی دانابوو، بە هەموو مەكر و فڕوفێڵێكەوە باوكی خاتوونی ڕازی كرد و كاتی مارەكردنی بۆ دیاریكردن.

سلێمان و خاتوون هیچ چارەیەكیان نەمابوو، كاتێكیان بۆ ڕاكردن دەستنیشان كردبوو، شەوێكیان لە جێی ژووان خۆیان لە گەڕەك دزییەوەو وێستگە بە وێستگە لە مووسڵ دووركەوتنەوە و گەراجی بەغدا گەیاندنییە پایتەخت، بە هۆی ناونیشانی ماڵە خزمێكیان گەیشتنە گەڕەكی فەزڵ، لەوێندەر كۆنە خانووێكیان بۆ پەیداكردن و بە كرێچیاتی گیرسانەوە.

سلێمان كۆڵهەڵگری دەكرد، پایلییەیەكی بچووكی سێ تایەی هەبوو، لە بازاڕی شۆرجە كاری پێدەكرد، ئێوارەش كە دەگەڕایەوە ماڵەكەی خۆی لە فەزڵ بە

ئاسـوودەیی لەگـەڵ خاتوونـدا دەژیـا.
منداڵییـان نەدەبـوو، هۆکارەکـەش خاتـوون بـوو، کـە پێدەچـوو ئـەو جارەی خـۆی لـە سـەربان فڕێدا و دەیویسـت لـە دۆزەخەکـەی زڕدایکـی ڕزگاری بێـت، هـەر ئـەوەش بـووە کـە ئەندامـی زاوزێی زەبرێکـی تونـدی بەرکەوتووە، بووەتـە هـۆکاری منـداڵ نەبوونـی، بـەڵام لەگـەڵ ئەمـەش لەگـەڵ یەکـدی ئاسـوودە بـوون.
سلێمان نەخۆشییەکـی سـەخت دەیخـات، یـەك سـاڵ لەسـەر جێگەوبـان دەمێنێتـەوە، ئـەو سـاڵە هەرچـی پـارە و خەرجـی پاشـەکەوتیان هەبـوو دەیخـۆن یاخـۆ بـە دەرمانـی دەدەن، دوایـی زانـرا کـە شـێرپەنجەیە و بـە ئازارێکـی سـەختەوە، خاتـوون لـە بەغـدا تەنیـا جێدەهێڵێـت.
ئـەو ژنـە هیـچ کارێك نازانێت و دەستەوئەژنۆ دەمێنێتـەوە، دوایی لەگەڵ مریەمی ماڵە دراوسـێیان لە یانەی شـەوانەی ئاسـیاوی سـوور، بـە ناچـاری دەبێتـە مێزخۆشـکەرێکی یانەکـە و شـەوانی درەنگیـش دەبێتـە بووکـی سـووری کڕیارەکان.
ئومێد لـە یەکـەم شـەوی سـەردانی ئـەم یانەیـەدا هەسـتی بەهێزێکـی موگناتیسـی ئـەو ئافرەتـە کـرد، لەگـەڵ ئافرەتانـی دیکـەدا بـە جۆرێکـی دیکـە بینـی، هەمـوو هەسـتەکانی ختووکەیـان دەدا، ئـەو هەسـتەی لـە دڵـدا چەسـپا ئـەوە ئافرەتـی نـاو بیـر و ڕوانینەکانییەتـی،

ئەو کەسەیە کە بیری لێکردووەتەوە و دەیەوێت بیکاتە بووکی خەونەکانی، زۆر بیری لێکردەوە، بە لای ئەوەوە قەیدی چی بوو، کە ڕابردووی تژی بوو لە هەناسە و شەهوەتی پیاوانی دیکە. ئەو دەیویست لە هەموو ئەم گوناهانە، کە لای ئەو گوناهیش نەبوون، بگرە لای خەڵکی بە گوناهـ دەهاتە دانان، لای ئەو ئافرەتێکی پاك بوو، با وایدابنێین گوناهیشی کردووە، ئەو دەیەوێت پاکی بکاتەوە، ئیدی بیکاتە پاکیزەیەك و بە ئەوینێکی خودایی تەعمیدی بکات و چی دی ئافرەتی شەوانی سوور و مێزخۆشکردنی یانەی شەوان نەبێت و ئیتر بیکاتە فریشتەی ناو خەونەکانی و هەموو ئەم پۆشاکانەی پێ فڕێ بدات، کە پێشتر لەبەری دەکردن، هەموو ئەو خواردن و خواردنەوانەی پێ بگۆڕێت کە پێشتر دەیخواردن و دەیخواردنەوە.

خاتوون کە زانی ژیانێکی نوێی بۆ ئامادەکراوە و دەیگەیەنێتە دونیای پاکی و ژینی ڕاستەقینە و دووردەکەوێتەوە لەم کارەی کە ئەو هەرگیز پێی ئاسوودە نەبوو، بەڵام ناچاری وایلێکردبوو پێی ڕازی بێت. حەزی دەکرد هەرچی زووە، ئەم ژیانەی ئێستەی بەکۆتا بێت و خۆی پاك بکاتەوە، ئومێدیش لاپەڕەیەکی نوێی لەگەڵدا هەڵدەداتەوە،و ئیدی ئەو تەنیا بۆ کەسێك و لە باوەشی کەسێکدا دەبێت، تەنیا حەزەکانی

کەسێك مەیسەر دەکات و چی دیکە بە ئازاری دەروونی و ویژدانی مردووەوە و هەستی ناجێگیرەوە شەو و ڕۆژانی خۆی بەڕێ ناکات، بەمەش بەڵکو خوا لە هەموو گوناهانی خۆش بێت و هێندەی تەمەنی لەم دونیا جەنجاڵەدا ماوە وەك خەڵکی ئاسایی ببێتە خاوەن خێزان.

تاکە کێشەی خاتوون نەزۆکی بوو، بۆیە دووەمین دیداری لەگەڵ ئومێد بە ڕاستگۆیی ئەم باسەی لەگەڵدا کردەوە، بەڵام ئەو ئەمەی بە خەوش و کێشەی نێوانیان نەزانی و لە بڕیاری هاوسەرگیریدا پەژیوانی نەکردەوە.

خاتوون دوای ئەوەی ئەوینی لەگەڵ ئومێددا گۆڕییەوە، هەموو شتێکیان بۆ یەکدی ئاشکرا کرد، هەستی دەکرد وا خەریکە باری قورسی سەرشانی سووك دەبێت، بۆیە لەو تافەوە هێندەی دەیتوانی خۆی لە شەوانی سوور دووردەخستەوە، بگرە قێزیشی لێدەبووەوە، تا ئومێد هات و خۆی خستە ناو ژیانی، ئەویش نەك هەر نەفرەتی لە کاری ناو یانەی شەوانەی ئاسیاوی سوور کرد، بگرە ڕووی خۆی لە بەغداش وەرگێڕا، لەگەڵ ئومێد لە ماڵێکی ساکاری گەڕەکە میللییەکەی کوران بەدەم ژیانێکی نوێوە لاپەڕەکانی ڕابردوویان ئاودیو کرد و هەردووکیان لە تەنیایی ڕزگاربوون،

لەو ماڵە نوێیەدا پێکەوە بوونە هاوماڵی کتێبان.

ئومێد کتێبفرۆش بوو، بەڵام کتێبخانەی نەبوو لە بازاڕدا، لە لایەکی پشتەوەی بن دیواری دادگە و لەسەر شۆستە کتێبانی ڕیز دەکرد، ئێوارانیش لەناو دوو سێ توورەکەی گەورەی دەکردنەوە و دەیخستنە ناو سندووقی پشتەوەی پاسکیلەکەی و دەیبردنەوە ماڵەوە. لە ماڵیشدا هەموو ژوور و کەلێن و قوژبنێکی پڕکردبوو لە کتێبان، شەوان کاتی خۆی بۆ خوێندنەوە و شیعرنووسین تەرخان کردبوو، دووناملکەی شیعری چاپکراویشی هەبوو.

خاتوونیش کە هاتە ئەو ماڵە کتێبە کوردییەکانی نەدەخوێندەوە، چونکە نەیدەزانی کوردی بخوێنێتەوە و بنووسێت، ئەو بە زمانی عەرەبی خوێندبوو، لەبەر هەندێ تەنیا کتێبە عەرەبییەکانی دەخوێندەوە، بەڵام چەندساڵێك بوو ئومێد تۆزێك فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی کردبوو، بۆیە هەموو کتێبێکی کوردی باش پێ نەدەخوێنرایەوە، بەڵکو زیاتر حەزی لە دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کوردی بوو، حەزیشی لە کاسێتەکانی دەنگی شوکروڵڵای بابان بوو، کە ئومێد لە ماڵەوە هەیبوو، ئەویش بەردەوام گوێی لە شیعری شاعیرانی کوردبوو بە دەنگی پڕ جۆشی بابان.

* * *

پەسنی ئەو کوڕەیان بۆ کردبوو، کە خاتوون دەستی لەگەڵ تێکەڵ کردبوو، بوو بە خۆشەویستی تازەی. ئەو کوڕەکەی نەدیبوو، نەشی دەویست بیبینێت، چونکە ئەگەر بیبینێت نەیدەتوانی بەسەرخۆیدا زاڵ بێت و دەبوو بیکوژێت، بەڵام ئەوێکی هەست ناسکی شاعیر و نووسەر و خوێنەر، کە لەناو کۆمەڵدا پێیان دەڵێن ڕۆشنبیر و پیاوکوژی دوو دنیای جیاواز بوون، ژبەر هەندێ تەنێ دەیتوانی بەسەر ڕك و تووڕەیی خۆیدا زاڵ بێت و دان بە خۆیدا بگریت و ئەم زام و سۆیەی ڤینە، ئەو هەموو ئێش و ئازارە لە دڵی خۆیدا کۆبکاتەوە، ئەمەش وایلێکرد ڕۆژ بە ڕۆژ گوشاری دەروونییان پتر دەکرد. ئاخر ئەو پێی سەیر بوو، بڕواشی بەوە نەدەکرد، ئەو کوڕە چۆن توانیویە دڵی خاتوون بەدەستبێنێت و لە چ دەلاقەیەکەوە، یاخۆ لە چ بۆشاییەکی ناو ژیانی ئەو لێی چووەتە پێشێ و چۆکی بە خاتوون داداوە.

هەموو بیرو هۆشی بۆ ئەوە دەچوو، هۆکاری سەرەکییش بە لای ئەوەوە تەنیا و تەنیا نەمانی پیاوەتی و دوورکەوتنەوە لێی و پشتگوێ خستنی بووە، بێ منداڵیش هۆکارێکی دیکە بوو، لای ئەو کە ئەو وای بۆ دەچوو، ئەو ماڵەی منداڵی تێدا نەبێت، ئیتر شەیتان لەوێ تەراتێن دەکات، بۆیەش لە ماڵی ئەواندا شەیتان

چووەتە بن كلێشەی خاتوون و ختووكەی حەزەكانی داوە، وای بیركردەوە، كە هەموو ئافرەتێك پێویستی بە دامركاندنەوەی حەزەكانی دەكات و دەبێت پیاوێكیش هەبێت بۆ كوژاندنەوی ئەو ئاگرە، ئیدی ئاگردانی ئەویش جگە لە مشكی و خۆڵەمێش هیچ تررووسكەیەكی لێ هەڵنەدەستا، بۆیە بە لای ئەوەوە بە هۆی ئەم هۆكارانەوە بووە، كە خاتوون بۆ ئەو كوڕە هاتووەتە ڕایێ و خۆشەویستی نێوانیشیان لای خاتوون تەواو كاڵ بووەتەوە، دەنا چۆن ئافرەتێك لەگەڵ گەنجێكی تەمەنی كوڕی خۆی تێكەڵ دەبێت و خۆشی دەوێت و جیاوازی تەمەنیش نابێتە بەربەست. ئاخر خاتوون تەمەنی لە نێوان سی و پێنج ساڵان و بەسەرەوە دەبوو، ئەویش تەمەنی بیست و دوو بەهار بوو.

ئەو كوڕە دووكانی فرۆشتنی جلوبەرگ و جوانكاری ئافرەتانی هەبوو لە بازاڕی كوران.

* * *

هێشتە نەگەیشتبووە، ئەو چرکەساتەی، کە خۆی فڕێ بدات، بیری لەوە کردەوە، کە مردن تاکە ڕێگەی رزگاربوونی بوو، ئەگەرچی ئەو چەندان جاری دیکە لە لێواری مردن گەڕابووەوە، لەو دەمەدا ئەوەی بیرهاتەوە، بە ڕێکەوت خوا تەمەنی نەبردەوە و ڕزگاری بوو، ئەو ڕۆژە ڕۆژی موبایەعەی سەدام حوسێن بوو، کە ١٩٨٢/١١/١٦ بوو کە هەرگیز لەبیری نەدەچووەوە.

ئەو ڕۆژە بۆ ئەو ڕێوڕەسمە، قوتابییانی هەموو قوتابخانەکانیان بە ڕێڕۆیشتن و بەرزکردنەوەی وێنەی سەدام و ئالآی عێراق بەناو شاردا سووڕاندەوە، چەند منداڵێکی پارچەڵەیان هێنابوو جلی تەلآیعییان لەبەر کردبوون، هەریەکەیان وێنەیەکی لە جام و چوارچێوەگیراوی سەرۆکی فەرماندەیان بەرزکردبووەوە.

بەیانییەکەی ئەو ڕۆژە، لە چەند لایەکی شار خۆپیشاندانی خەڵك دەستی پێکرد، هوتافی خەڵکی چاوساغی ناو خۆپیشاندانەکان دەنگیان دەگەیشتە هەموو لایەك، خۆپیشاندەرانیش ئەوەندی دیکە بە پەرۆشەوە وەڵامی هوتافەکانیان دەدایەوە، ئەوەی گوێشی لە پێشڕەوانی ڕێڕۆیشتنەکان نەدەبوو، لەگەڵ دەنگی بەرزی وەڵامدەرانەوە لە خەڵکیان دەگەیاند،

کە خەڵکەکە دژی ڕژێم و دارودەستەکەی دەنگیان هەڵبڕیوە، ئامانجیان ڕووخانی ئەم ڕژێمە بوو، کە بە ئاگر و ئاسن حوکمی ئەو عێراقەیان دەکرد و کوردیشیان لەناو دەبرد، ئەگەر تەواو بۆیان بچووبایە سەر دەبوو بگێڕدرێتەوە کە لە عێراقدا میللەتێک هەبووە ناوی میللەتی کورد بووە.

ئەو ڕۆژە ڕژێم بە هەموو هێزی داپڵۆسێنەری خۆیەوە بەناو شار وەربوون و ئاگری خۆپیشاندانەکانیان دامرکاندەوە.

هەر ئەو ڕۆژە چەندان گەنجی خوێن گەرم کەوتنە دەست ئەمنەکان و ڕاپێچی دائیرەی ئەمنیان کردن.

لەو لاشەوە ڕێڕۆیشتنی قوتابیان و تەلائیعییەکان بۆ موبایەعەی سەرۆکی فەرماندە گەیشتە نزیک دادگەی هەولێر و گەیشتە لای دیواری پشتەوەی دادگە، ڕێک لەو شەقامەی کە ئومێد و کاوە سەرسپی و شوان و پشتیوان و عەلی و ئەمیر لەبن دیواری دادگە و لەسەر شۆستە کتێبەکانیان بۆ کڕیارانی کتێب خستبووە ڕوو.

ئەو دەمە دوو سێ گەنجی خوێن گەرم بە پێچەوانەی ڕێڕۆیشتنی قوتابیان هاتن و پێچەوانەی هوتافی ئەوان دژی دیکتاتۆر و ستایشی پێشمەرگە و بژی کوردستان و بە هاوارەوە هوتافیان دژی ڕێڕەوەکە کێشا.

گەنجێکی جوانی خوێن گەرم کە قوتابی پێنجی ئامادەیی بوو ناوی سەلاح جەوهەر بوو، تەماشای ئاسمانی کرد، هەڵۆیەکی بینی لە ئاسماندا بەسەر ئەو ناوەدا دەسووڕایەوە، جارجارە وێنەی ڕاستەقینەی خۆی پیشان دەدا، کە وێنەی سەربەست بوو، ئەو ڕۆژە خۆی و مەفرەزەکەی هاتبوونە ناو شار و وەرەیان بە خۆپیشاندەران دەبەخشی، سەلاحیش هێزی خۆی لەو هەڵۆیەدا بینی، بۆیە وەك شێر نەڕەی لێهەستا و بازێکی دا و وێنەیەکی گەورەی سەدامی لە دەست کچێکی تەلایعی دەرهێنا و وێنەکەی بە هەموو هێزێکییەوە بە عەردی دادا و جام و چوارچێوەکە ورد و خاش بوو، دواییش پڕی دایە وێنەکە و دڕاندی، ئەوجا کەفوکوڵی دامرکایەوە، ڤێجا بەدەم هوتافی (بژی کورد و کوردستان، بڕوخێ بەعسی خوێنڕێژ و فاشیست، مردن و سەرشۆڕی بۆ دیکتاتۆر) و چەندان دروشمی شۆڕشگێڕی دیکە چەندان گەنجی خوێنگەرمی دیکەی هێنایە ناو ڕێڕەوەکە و وردە وردە خەڵکی دیکەی لێ کۆبووەوە و شێوەی خۆپیشاندانێکی پێچەوانەی بەخۆوە بینی.

دوو ئەمنی ڕەشتاڵەی کەتە و پتەو بە چاوی پڕ لە ڕك و کینەوە هاتنە ناو خۆپیشاندانەکە و بە هەردووکیان پڕیان دایە سەلاح و لەملاو ئەولا دەستیان گرت و رایانپێچا، بەڵام سەلاح گەنجێکی بەهێز و بە توان

و بوێر بوو، خۆی تێكنەدا و بە ئەسپایی هەردوو ئەمنەكەی بە یەكدی دادا و ڕایكرد.
ئەمنەكان دەمانچەكانیان دەرهێنا و سەلاحیش هێشتە ڕایدەكرد، بە هەردووكیان تەقەیان لێكرد، چەند گوللەیەك پێكای و برینداربوو و كەوت و شەلالی خوێن بوو.
ئەوان لێنەگەڕان هیچ كەسێك لە سەلاح نزیك بێتەوە، ئەویش هەر پەلی دەكوتا و هاواری فریاكەوتنی دەكرد، دوایی هاواری ئاوی كرد هەر هاواری دەكرد: ئاو، ئاو، ئاوم بگەیننێ خنكام.
ئەمنەكان نەیانهێشت نە كەس لێی نزیك بێتەوە، نە فریاگوزاری بگاتێ و نە كەسیش بیبات بۆ نەخۆشخانە، نە كەسیش بە قومێك ئاو لێوانی وشكی تەڕ بكات، تا بەدەم ئازار و خوێنبەربوونی زۆرەوە ئاوزینگی دا و گیانی سپارد.
ڤێجا بەربوونە وێزەی خۆپیشاندەران، ئەوەی دەستیان كەوت گرتیان و خستیانە ناو ماشێنەكانیان و بردنیان بۆ دائیرەی ئەمن.
ڕێڕەوی قوتابیانیش، كە موبایەعە و ستایشی سەرۆكی فەرماندە بوو پەرتەیان لێكرد و هەر كەسەی بە لایەكدا هەلات و خەڵكی خۆپیشاندەریش بەهێز بلاومیان پێكرا.

ئەو ڕۆژە و هەر لەم ڕووداوەدا بوو، کە ئومێد لە مردن گەڕایەوە، چونکە لە تەقەکردنی ئەمنەکان کە ئاڕاستەی سەلاحییان کرد، گوللە بە چەند کتێبێکی ئومێد کەوتن و لە جەستەی ئەو زۆر نزیک بوون، بۆیە ئەوجاری مەرگ بە تەنیشتیدا ڕەت بوو، لێ لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی نەکرد.

ئومێد خۆی برادەری سەلاح بوو، ئەویش کتێبی زۆری لێدەکڕی، ئەگەرچی ئەو بە بیروباوەڕ هەڵگری بیری نەتەوەیی بوو، بەلام لەگەڵ ئەمەش کتێبی مارکسی زۆر دەخوێندەوە، زۆریش دەهاتە لای ئومێد، ئەویش خۆشی دەویست و متمانەی پێی هەبوو، کە کتێبی قەدەخەکراوی بداتێ و پێی بفرۆشێت.

ئومێد و کتێبفرۆشەکانی دیکە بە پەلە کتێبەکانی خۆیان پێچایەوە و بەرەو ماڵ شۆڕبوونەوە، ئەگەرچی هەموویان بۆ سەلاح زۆر بە پەرۆش بوون.

دوای ئەوەی دەنگی تەقە کپ بوو، ئەو ناوە چۆڵ بوو، کەسوکاری شەهید سەلاح گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە و دەرفەتی ئەومیان پێدرا، تا تەرمەکەی هەڵگرن و بیبەن بۆ پزیشکی دادوەری و ڕاپۆرتی مردنەکە وەربگرن و دواتریش بینێژن.

بۆ بەیانی لە مزگەوتی حاجی بەکری زەڕەنگەر پرسەیان بۆ دانا. دوو ڕۆژان ئاسایی بوو، بەلام لە ڕۆژی

سێیەمی پرسەدا، خۆپیشاندانی قوتابیانی خوێنگەرم لە بەردەم ئامادەیی کوردستان بەڕێکەوتن و هاتنە پێش مزگەوتی حاجی بەکر، بەردەم شوێنی پرسەی شەهید سەلاح، ئەو ڕۆژەش پرسەکە لە هەردوو ڕۆژەکەی پێشووتر گەرم و گوڕتر بوو.

لەبەردەم مزگەوت خۆپیشاندەران هوتافیان دەکێشا.

ئەوان دەمان وەها بوو، هەموو دژەکانی بەعس و ڕژێمەکەی هەر لە شیوعی و مارکسی و حیزبە نەتەوەییەکانی کوردستان و ئیسلامییەکانیش لە خۆپیشاندانەکاندا خۆیان لە یەکدی جیا نەدەکردەوە، شان بە شانی کەسانی بێلایەن هەموو پێکەوە بۆ یەك ئامانج دەڕژانە سەر شەقامەکان، ئەو ڕۆژەش وابوو هەموو لایەك بۆ پەرۆشی شەهید سەلاح لەبەردەم مزگەوت گردبوونەوە و کردیان بە خۆپیشاندان.

یەکێك لەو خۆپیشاندەرانە گەنجێکی خوێن گەرمی شیوعی بوو، ناوی سەلاح سەرسپی بوو، ئەو ناوەشی بۆیە لێنرابوو، چونکە هەموو سەری سپی بووبوو، ئەو پێش هەمووان هوتافی کێشا و وتی:

- ئێوە چین و چیتان دەوێت؟

خۆپیشاندەرانیش هەموو پێکەوە وەڵامیان دایەوە:

- خوێنی شەهیدانمان دەوێت.

خەڵکی ناو مزگەوت کە لە پرسەکەدا بوون،

هەموو هاتنەدەر و تەماشای خۆپیشاندەرانیان کرد، ئەوجارە کەیفی چۆلی کە سەر بە ڕێکخستنەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوو هاواری کرد:
- ئێوە چین و چیتان دەوێت؟
ئەوانیش بە کەسانی ناو پرسەکەشەوە هەموو پێکەوە وەڵامیان دایەوە:
- خوێنی شەهید سەلاحمان دەوێت.
- بژی .. با .. بڕوخێ .. با .. مردن و سەرشۆڕی بۆ دیکتاتۆر و جاش و خۆفرۆشان.
بەم جۆرە هوتاف کێشان بەردەوام بوو.
کامەران شۆڕشگێڕیش کە لەبەر ئازایەتی ئەو ناوەی لێنرابوو، گەنجێکی خوێن گەرمی سەرشێتی سەیداوە بوو، ئەو سەر بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان بوو، ئەوجارە ئەو هاتە پێشەوە و پڕ بە دەنگی هاواری کرد:
- ئێوە چین و چیتان دەوێت؟
خۆپیشاندەران و کەسانی ناو پرسە و کەسوکاری شەهید سەلاحیش هەموو پێکەوە بەرسڤیان دایەوە:
- تۆڵەی ڕۆڵەی خۆمان دەوێت.
ئینجا کارۆخ زەندی داوای لە خۆپیشاندەران کرد بەرزی بکەنەوە تا شیعرێك بخوێنێتەوە. سەلام سەعدون و خەلیل خۆشناو و سەفین مەخموری هەرسێکیان

داوایـان لێکـرد بێتـە سـەر شـانی یەکێکیـان، دوایـی چـووە سەرشـانی عومـەر باگـوردان، کـە لـە هەموویـان بەوەجتـر بـوو، ڕەمـەزان ئاکرەیـی و قـادر هەرتەلـی و عەلـی عـارەب هەرسێکیان داوایان لێکـرد شـیعرەکەی کامـەران موکـری بخوێنێتـەوە، کـە لە هەموو بۆنەکاندا دەیخوێنـدەوە، ئەویـش پڕ بە دەمـی شـیعرەکەی خوێنـدەوە:

- دایە تۆ منت بۆ پەروەردە کرد؟
بۆ خۆشیی خۆت بوو یا گەلی کورد
وا من بۆ گەلم خۆم ئەدەم بە کوشت
خوای ئەکرد دەریای فرمێسکت ئەڕشت

مەولـود چاوشـین هـەر لەجێـوە لـە کارۆخـی وەرگرتـەوە و شـیعرێکی دیکـەی کامـەران موکـری خوێنـدەوە و هـاواری کـرد:

- وتیان: ئەو ڕێیەی کە تۆی لەسەری
مانای ئەوەیە بە لاوی ئەمری
منیش پێم وتن ئەم ڕێە نەگرم
بە گەردن کەچی و کەساسی ئەمرم

ئەوجارە سیروان ماندوو داوای کرد و فەرهاد دهۆکیش خسـتییە سـەر شـانی خـۆی و ئەویـش هـەر چوارینێکـی کامـەران موکـری لەبـەر بـوو، پـڕ بـە دەنگـی هـاواری کـرد:

- چاوم هەڵێنا دیم ئەم میللەتە

دیمەنی ژینی قەنارە و پەتە
گوێم بە دەنگی (ئاخ) زرنگایەوە
دەمم بە هاوار هەڵهێنایەوە
بۆیە هەر ئەبێ پشکۆی تۆڵە بم
قوربانی خاك و هی ئەم خۆڵە بم

هاوار گەرمیانیش، عەتا عەربەتی خستە سەر شانی خۆی و داوای لێکرد بە شیعرێکی شۆڕشگێڕی (قانع) کۆتایی بە هوتافی شیعردان بێنێت، ئەویش ئەم شیعرەی خوێندەوە و هاواری کرد:

- بووکی ئازادیم ئەوێ، خوێنم خەنەس بۆ دەست و پێی
ئەڵقە ئەڵقەی پێوەنم، وەك پڵپڵە و لەرزانەیە
گەرچی دوژمن وا ئەزانێ من بەدیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ! کونجی زیندانم قوتابی خانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێ
قوڕبەسەر ئەو دوژمنە، هیوای بە بەندیخانەیە
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە
چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکا
میللەتم بۆ ئەو مەبەستە کردەوەی شێرانەیە

دوو سێ نووسەر و شاعیری دیکەیش ویستیان شیعری شۆڕشگێڕی شاعیرانی دیکە بخوێننەوە، لەوەدەمە دائیرەی ئەمن بە خۆیان و چەند هێزێکی چەکدارەوە، بە چەند زیلی سەربازییەوە گەیشتنە بەردەم مزگەوت و خۆپیشاندەرانیش ڕایانکرد و پەرتەیان لێکرد، ئەمنەکانیش دەرگەی مزگەوتیان داخست و پرسەکەیان بە کەسوکاری شەهید سەلاح هەڵگرت.

خۆپیشاندەران بە ئاراستەی جیاواز پەرتەیان کرد و هەر بابایە هەڵدەهات، هەندێك لەو خەڵکە ڕوویان کردە مزگەوتی باقلانی، کە نزیك تانکی سەیداوە بوو، هەندێکی دیکەیشیان لەناو کۆڵانە تەنگەبەرەکانی سەیداوە بزر بوون.

گەنجە خەپەکەش کە ماڵیان نزیك مزگەوتی سەیداوەی سەر کەندێ بوو، لەوێ دەیخوێند و هەردەم لەبن حەسیری مزگەوتدا کتێبەکانی مارکسی و لینینی دەشاردەوە و نەیدەوێرا بیانباتە ماڵەوە، بە ئاراستەی ئەم مزگەوتە چەند کەسێکی دیکەی لەگەڵ خۆیدا برد و خۆیان لەوێندەر شاردەوە.

ئەو ڕۆژە تاکوو ئێوارە خەڵکەکە لە مزگەوت و ماڵاندا مانەوە.

پلکە خەجیج کە دایکی سەلاح سەرسپی بوو، لە

بەردەم دەرگەی خۆیان وەستابوو، پێچەوانەی ژنانی دیکە دەرگەی ماڵەکەی بۆ خۆپیشاندەران کردەوە و لۆمەی ئافرەتانی کۆڵانی خۆشیانی کرد، کە لە ترسا دەرگەیان دادەخست.

چەند ڕۆژێك دوای پرسەکە کەسوکاری شەهید سەلاح، بە هۆی پۆلیسێکی بەر دەرگەی دائیرەی ئەمن کە ماتۆڕێکیان بۆ کڕی، ناو و وێنەی ئەو دوو ئەمنەیان وەرگرت، کە شەهیدیان کرد.

دائیرەی ئەمن هەموو حیسابێکیان بۆ خۆیان و پیاوانیان دەکرد، دوای تاقیبکردن زانییان کە دوای ڕووداوەکە دائیرەی ئەمن دوو کەسەکەی گواستووەتەوە نەوەك تۆڵەیان لێ بکرێتەوە.

(٢)

دەڵێن دوا پلەی ئیشق فەنابوونە، ئەو کاتەی ئاشق، یان ماشوق لە پێناوی ئیشقەکەیدا ئامادەیە گیانی خۆی فیدا بکات، ئەگەر ماشوق لە ڕێگەشدا لابدات ئەو سووتانی هەر بەردەوامە و هیچ شتێکی نییە جگە لە بیرکردنەوە لەو.

ئومێدیش وابوو، لەو ڕۆژەوە کە لە یانەی شەوانی ئاسیاوی سوور خاتوونی بینی و کەوتە بەر دڵی و خۆشی ویست و ئاشقی بوو، دواتریش کردیە هاوسەری خۆی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر ئاشقی ئەو ژنە دەبوو، ئەگەرچی دەشیزانی وەك پێویست بایەخی پێنەداوە، بە ڕۆژ تا ئێوارێ خەریکی کتێبفرۆشتن بووە و لای نەبووە، بە شەوانیش ئەگەرچی لە ماڵەوە لەگەڵیدا بووە، بەڵام تاوێك خەریکی شیعرنووسین و دەمێکێش بە خوێندنەوەی کتێب مژوول بووە، ئەویش لەو ماڵەدا پێویستی بە کەسێك هەبووە تاکوو قسانی لەگەڵدا

بـكات و لـه خەمەكانـی سـووك بـكات و بـاس و خواسـی دنیـا و ژیانـی لەگەڵـدا بـكات، بۆیـه خاتـوون ورده ورده بـه تێپەڕبوونـی كات ئەوینـی ئومێـدی لـه نـك كاڵ دەبێتـەوە.

ئـەو لـە سـەرەتای دیتنیـدا ئاشـقی بـووە و بـەو كەسـەی زانیـوە، كـە ڕزگاركـەر و بەدیهێنـەری خەونەكانـی بـووە. ئەگەرچـی تـا ڕۆژانـی كۆتاییش لـە ماڵەكەیانـدا پێكـەوە ژیـاون و سـۆزێكی بـۆی هەبـووە و بەرگـەی هەمـوو هەڵسـوكەوتەكانی ئومێـدی گـرتـووە، لـێ وەك باسـی ڕێسـاكانی ئیشـق دەكـەن، جـاری وا هەیە بەرانبـەر وەك ئـەو نابێـت، یاخـۆ ناتوانرێـت پـەرە بـەم خۆشەویسـتییە بدرێـت و هەڵسـوكەوتی وا دەكـەن، یەكێك ڤینـی ئەوی دیكـەی لـە نـك كاڵ بێتـەوە و ئەڤینـداری كەسـێكی دیكـە بێـت، ئەگەرچـی یەكێكیشـیان ئـەو ڤینـەی لەنـاو دڵیـدا بمێنێـت، یاخـود لێكترازانێكـی ڕۆحـی و جەسـتەیی هەبێـت، یـان بـە هەسـت و سـۆز و هاموشـۆ لێـی دابب‌ڕێـت و ئـەوەی دیكـە هەسـت بـە بایەخـی جـاران نـەكات.

جـاری واش هەیـە مرۆڤـی ئەڤینـدار دەگاتـە ئـەو ڕادەیـەی لـە یـەك كاتـدا ئەڤینـداری دوو كەسـان دەبێـت، یاخـۆ وابـووە ئاشـق، یـان ماشـوق ئیشـقی یەكەمـی لا كاڵ دەبێتـەوە، جـا بـە هـەر هۆكارێـك بێـت و ئیشـقێكی

دیکـه جێـی ئـەو ئیشـقە دەگرێتـەوە.
خاتـوون وایلێهاتبـوو لەوەتـەی هاتوچـۆی ڕێـداری دووکانـداری دەکـرد لـە بـازاڕی کـوران، سـەرەتا بـە یەکدی ناسین دەستیپێکرد، ڤێجـا بوو بە سەرسامبوون و ڕالێبـون لـە جوانـی و هەڵسـوکەوت، ئەویش هێنـدە بـە نەرمـی و سـۆزەوە قسـانی لەگەڵـدا دەکـرد و پەسـنی جوانییەکـەی دەکـرد و خۆزگـەی ئـەوەی بـۆ دەخواست، کـە کەسـێك هەبێـت شـایانی ئـەو بێـت، خاتوونیـش چەنـد سـاڵێك بـوو، نـە هەسـتی بـە سـۆز و ڕامووسـانێك دەکـرد، نـە گفـت و لفتێکـی ئومێـدی دەژنەفـت، بۆیـە ئـەم ڕەوتـارەی ڕێـداری بـە نزیکبوونـەوە لـە ڕۆحـی خـۆی زانـی.
یەکەمجـار کـە شـەرمیان لێکـدی شـکا، ڕێـدار بـە نـەرم و نیانـی و گفـت و لفتـی تـژی لـە سـۆزەوە خـۆی خسـتە نـاو ناخـی خاتـوون:
- خاتوون، بە ڕاستی تۆ خاتوونی.
- تو خوا بەڕاستتە، ڕات لە منە؟
- زۆریش.
- ڕات لە چی منە؟
- زۆر جوانیت و خوێن شیرینیت.
- ئاخـر لـە مـن جوانتـر هەیـە، مـن بـەو تەمەنـەوە جوانـی چیـم پێمـاوە!

- بۆ چەند سالانیت؟
- تەمەنم سی و پێنج ساڵ پترە.
- مێردت هەیە؟
- بەڵێ.
- خۆشت دەوێت؟
خاتوون بە شەرمێکەوە خۆی لەم بەرسڤە ڤەشارت و ڕووی خۆی بۆ لاکەی دیکە وەرسووڕاند.
ئەوجا کە شەرمەکەی ڕەوییەوە ئەو پرسیاری لە ڕێدار کرد:
- کاك ڕێدار تۆ تەمەنت چەندە؟
- توخوا پێم مەڵێ کاك، تەنیا پێم بڵێ ڕێدار، تەمەنم بیست و دوو ساڵە.
- ژنت هێناوە؟
- نەخێر هێشتە بوخچەی نەکراوەم.
- چۆنە تا ئێستە ئەو بوخچەیە نەکراوەتەوە؟
- ئەو ئافرەتەی من دەمەوێت هێشتاکە لە دەرگەی دڵی نەداوم.
- هیچ ئافرەتێك سەرنجی ڕانەکێشاویت؟
- با، خەریکە ئافرەتێك دڵم دەدزێت!
- کێیە، پێم نالێیت؟
- ئەگەر لێم قبووڵ بکەیت، ئەوە تۆیت.
- ئاخر من لە تۆ بە تەمەنترم و مێردیشم هەیە.

- ئاسـاييه، چـی تێدایـه، ڤیـن و خۆشەویسـتی هیـچ بەربەسـتێك نازانێـت.
- بۆچی من...؟
- تـۆ كەوتیتـه بەردیـدەم و تیـری ئەوینـی تـۆ پێكامـی و هـەلا هـەلای كـردووم.

ئـەو ڕۆژە خاتـوون هیـچ بەرسـڤێكی ڕێـداری نەدایـەوە، بـە شـەرمێكەوە خواحافیـزی لێكـرد، هەرچـی ماكیـاج و بـۆن و جلكـی هەڵیبژاردبـوو ڕێـدار كـردییە دیـاری و زۆر هەوڵـی لەگەڵیـدا، لـێ پـارەی لێومرنەگـرت.

چەنـدان ڕۆژ بـوو پەیڤانـی ئـەو كـوڕەی لـە مێشـكی خۆیدا دەهێنـا و دەبـرد، ئەویـش ئـەو كـوڕەی كەوتـە بـەر دڵان. گەنجێكـی بـاڵا بـەرزی پـڕ، دەم و چاوێكـی جوان و دەم بـە خەنـدە، قژیشـی وەك مۆدیلـی نوێـی گەنجـان تاشـیبوو، تەنكـە ڕدێنێكـی سـەكسـوكی جێهێشـتبوو و مۆدیلـی جلەكانیشـی سـەرنجڕاكێش بـوو.

ئـەوەی كـە جێـی پرسـیار بـوو و لێـی دەسـنگرایەوە جیـاوازی تەمەنیـان بـوو، ڤێجـا بیـری لەوە دەكـردەوە، كـە ئـەو مێـردداره و بـە خۆشەویستیشـەوە ژیانـی هاوسـەرییان پێكهێنـاوە، پاشـان چاكـەی ئومێـدی بیركەوتـەوە، كـە لـە چ بارودۆخێكـی سـەختدا ئـەوی خۆشویسـت و لـە ژیانـی لەشفرۆشـی ڕزگاری كـرد و ژیانێكـی نوێـی پـێ بەخشـیوە، بـەڵام لـە لێكدانەوەكانیـدا هـەر

خۆی لەبەر خۆیدا پتر لە هزران ڕۆچوو، بیری لە ساڵانی ڕابردووی خۆی دەکردەوە، کە چۆن لە ژیانی هاوسەری و خۆشەویستیدا لەگەڵ ئومێد کەوتبووە ناو دۆزەخێکی ڕۆحی و بۆشاییەکی گەورەی سۆزداری بۆ چێ بووبوو.

لە نێوان ژیانی هەردووکیاندا پەرژینێك دروست بووبوو، هەستی بە کاڵبوونەوەی ئەوینەکەیان دەکرد، ئەگەرچی دەشیزانی ئومێد هێشتاکە ئەڤینداری ئەوە و واز لە ڤانەکەی ناهێنێت و دەستبەرداری نابێت، لێ ئەو بیری دەکردەوە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت با هەر ئەڤیندارم بێت، کە من ئەو ڤینە بە ساردی ببینم، نەبێت چاترە.

دواجاریش لەم پەیڤینەی ناخیدا هەر خۆی وەڵامی دەروونی خۆی دەدایەوە و لە دڵی خۆیدا، ئەمەی بە هەڕبوونێکی رۆحی مردووی خۆی دەبینی و بە خۆی دەگوت (جا مرۆڤ دەتوانێت لە ڕووخاندا سەرکەوتن بەدەست بێنێ و دەشتوانێت جارێکی دیکە گیانی خۆی زیندوو بکاتەوە و جارێکی دیکەیش بە جۆرێکی دیکەوە ئەویندار بێتەوە)

ئەم لێکدانەوانە هێشتاکە ئەو متمانە ڕۆحییەیان لە نك چێ نەدەکرد، چونکە بیری لەوە دەکردەوە، تا ئەو کاتەش ئەو کوڕەی چووە بە دڵدا و وا خەریکە

ناخـی دەهەژێنێـت، ئـەو هێشـتە ناتوانێـت دەسـتبەرداری ئومێـد بێـت، هـەر خۆشـی بەرسـڤی خـۆی دەدایـەوە و دەیوت (بـەڵام خۆ ئومێدیش بۆ ئـەو ئیدی ئـەو ئومێـدەی جـاران نییـە، ئەگەرچـی هێشـتاکە ئومێـد بـۆ ئـەو گەیشـتبووە دۆخـی فەنـا و دەسـتبەرداری خاتـوون و ئیشـقەکەی نەدەبوو، بەڵام چی بـکات دڵـە و پێویستی بـە سـۆز و دەسـت بەسـەردا هێنـان و قسـەی خـۆش و لاواندنـەوە و پیاهەڵـدان و ڕامووسـان و ئامێزێکـی سـۆزدار هەیـە.

ئیـدی ئومێـد بـۆ ئـەو، باوەشـە گەرمەکـەی جـاران نەبـوو، وا کەسـێکی دیکـە ئـەو سـۆز و باوەشـە گەرمـەی دەداتـێ و دەیەوێـت ژیانێکـی نوێـی پـێ ببەخشـێت، ڤینێکـی دیکـە لـە دەرگـەی دڵـی داوە و دیهەژێنێـت، چیـدی بەرگـەی کەمتەرخەمییەکانـی ئومێـد ناگرێـت.

جارێکـی دیکـە لێکدانـەوەی دڵـی پێـی دەگـوت (ئاخـر ئـەو کوڕە نزیکـەی چواردە سـاڵ لـەو بچووکتـرە!)

هـەر خـۆی بەرسـڤی دڵـی خـۆی دەدایـەوە و دەیگـوت (هیـچ کاتێـك تەمـەن لەبـەردەم ئەویـندا بەربەسـت نەبـووە، دڵ کـە تیـری ڤینـی بەرکـەوت، هەمـوو سـنوور و تخووبـەکان ڕادەماڵێـت، سـەرجەم بەربەسـتەکان تەخـت دەکات، ئاخـر ئەویـن ئاوایـە، خۆشـت نازانیـت لـە

کوێوه بۆت دێت، هەر هێنده ئەڤیندار بوویت، ئیدی تەواو)

خاتوون نەیدەتوانی واز لەو کوڕه بێنێ، ئەویش پتر بایەخی پێدەدا و دەیلاواندەوه و سەرسامی خۆی بۆ پیشان دەدا و بە پێشکەشکردنی دیارییش زیاتر بۆ لای خۆی بکێشی دەکرد.

خاتوون وەك ژنێکی خورت و بزێو و سەرکەش، کەوتە ناو تۆڕی خۆشەویستی ڕێدارەوه و نەیتوانی لێی ڕزگاربێت و بۆ دووەمین جار ئەڤیندار بووەوه.

* * *

وای لێهات خاتوون نکارێت دەستبەرداری ڕێدار بێت، بە هەموو جۆرێك دەیویست دڵی ئەو ڕابگرێت، بۆیە بەڵێنی ئەوەی پێدا، ئەگەر بۆ ئەو بێت خانووەکەش بە ناوی ئەو دەكات، چونکە کاتی خۆی ئومێد زۆر خۆشی دەویست و ئەویش داوای لێکرد خانووەکەیان لەسەر ناوی ئەو تۆمار بکات، ئومێدیش خستییە سەر ناوی ئەو، وا ئێستەش ئامادەیە ئەویش بیخاتە سەر ناوی ڕێدار.

ڕێدار و خاتوون بوونە ئاشق و ماشوق، بێ یەکدی نەیانتوانی بژین، ڕۆژێ جارێك خاتوون بۆ بینینی ڕێدار دەچووە بازاڕی کوران و دەیبینی و جارجارەش لە ماڵی خوشکەکەی ڕێدار ژووانێکیان دادەنا.

خوشکەکەی ڕێدار ناوی ڕێزان بوو، لەگەڵ نەوزادی مێردی پێکەوە لە فەرمانگەی تەندروستی هەولێر فەرمانبەر بوون. ڕێدار کلیلی دەرگەکانی لە ڕێزان وەرگرتبوو و کۆپی کردبوو، ژووانەکانیشیان بە چاوساخی ئەو بوو، ئاگای لە پێوەندیی خۆشەویستی و یەکدی بینینەکانیان هەبوو، براکەی بە دیاری و بەخشیش دەمکوتی کردبوو.

ڕێزان تاکە ڕەخنە لە ڕێداری برای ئەوە بوو، کە ئەو بۆچی لەو هەموو کچانەی دنیا ئاشقی ئافرەتێکی مێرددار بووە و تەمەنیشیان زۆر جیاوازە، ڕاستە لە

کوردمواریدا تەمەنی پیاو لە سەرووی تەمەنی ژنەوەیە، بەڵام ئەوان پێچەوانە بوون و نێزیکەی چواردە ساڵ جیاوازی تەمەنیان هەبوو! ئەویش بەرسڤی خۆی پێبوو کە دەیوت:

- ئاخر دڵی من ئەوی هەڵبژاردووە و ئەڤینداری بوومە، با مێردیشی هەبێت، بڕیاری داوە خۆی پێ تەڵاق بدات، جیاوازی تەمەنیش گرینگ نییە، لای من ئەو جوانترین ئافرەتە، کە خوای گەورە هێنابێتییە سەر زەمین، ئیدی داهاتووشمان جوانە، چونکە بڕیاری داوە و پەیمانی داوەتێ دوای هاوسەرگیریمان خانووەکەیشم بە ناو بکات و خۆشم دووکاندارم و خۆشترین ژیانمان دەبێت.

خاتوون بابەتی منداڵ نەبوونیشی بە ڕێدار گوت، بەڵام ئەو بەمەش ڕازی بوو، هەم لەبەرئەوەی ئەڤینداری ئەو ژنە بوو، هەمیش بە هۆی ئەوەوە دەبێتە خودان خانوو و ماڵی خۆی و بەختەوەربوونیشیان پێ لە منداڵ و نەوەخستنەوە گرینگتر بوو، ئاخر ئەو لە یەك ماڵدا لەگەڵ خاتوون بژییەت، لای ئەو هەموو دنیا بوو.

*        *        *

ئومێد ڕەشپۆش هێشتە لە سەربان بوو، بە دەروونێکی ورد و خاش و ڕووخاوەوە، حەزی خۆفڕێدان لە سەربانەوە بەسەریدا زاڵ بوو، لێ باڵەفڕەی بەردەوامی هۆش و بیرهاتنەوەی ڕابردوو، هێشتاکە لە یادەوەرییەکانیدا ناپچڕێت و نەگەیشتووەتە دوا خاڵ و خۆفڕێدان و کۆتایی.

باڵەفڕەی چەندان دۆخی گرینگ و چارەنووسساز لە ژیانیدا، ئەویان خستە ناو ئەو بارودۆخە سەختە و تەنگیان پێی هەڵچنی، ئەمجارە ئەو ڕۆژەی بیرهاتەوە، کە بانگهێشتی دادگەی بۆ هات و گەیشتە ڕۆژی دادگەییەکە، ئەو ڕۆژەی خۆی بە مردوو زانی لەسەر زەوی ئەگەرچی هێشتە لە گیانیشدا مابوو، ئەو ڕۆژەی لەلا وەك ئەوە وابوو بیخەنە ناو ئاگری دۆزەخ، ئیدی لەوساوە هەستی کرد، کە ژیانی لەگەڵ خاتوون بەرەو کۆتایی و دوا وێستگە دەچێت.

ئەو دەمانەی بیرهاتەوە، کە نووسراوی فەرمی دادگەی بۆ هات بۆ دادگەیی و جیابوونەوە، ئەو ڕۆژە دیسان کەوتەوە گوتووێژ لەگەڵ خاتوون، بەڵام ئەو بڕیاری خۆی دابوو و بێ ئەنجام مایەوە:

- ئەو هەموو خۆشەویستییەی ئێمە چی لێهات؟
- بە با چوو تۆ هەموویت سڕییەوە.

- من سڕیمەوە، یاخۆ حەز و ئارەزووەکانی تۆ بوو؟
- مـن دوورنەکەوتمـەوە، هێشـتە سـۆزێکم بـۆ تـۆ مـاوە، بـەڵام تـۆ خۆشەویسـتی منـت بـە کتێـب و شـیعرەکانت گۆڕییـەوە، نـە بـە ڕۆژ بـۆ مـن بوویـت، نـە شـەویش هەسـت و سـۆزی جارانـت بـۆم هەبـوو!
- چـۆن توانیـت خۆشەویسـتی مـن زیندەبەچـاڵ بکەیـت و لەگـەڵ گەنجێـك ببیتـە خۆشەویسـت کـە وەك کـوڕی تۆیە؟
- ئیـدی ژیـان وایـە خۆشەویسـتییەك لەنـاو دەچێـت و خۆشەویسـتییەکی دیکـە جێـی دەگرێتـەوە.
- تۆ چاکەی منت لەبیر کرد؟
- چاکەی چی؟
- چاکـەی ڕزگارکردنـت لـە دۆزەخ، ئەگـەر مـن نەبووام، تاکـوو ئێسـتەکەش تـۆ جەسـتە و ئەندامـی مێینـەت بـۆ خەڵکـی بـوو.
- ئەمـە ڕاسـتە، بـۆ ئەوسـا و هەڵوێسـتی جوانـی تـۆ چاکەیەکـە و لـە بیـری ناکـەم و لـە ئەسـتۆمدایە، بەڵام دواجـار تـۆ وردە وردە ئـەم جوانیانەشـت سـڕییەوە.
- دەکرێـت لـە ماڵێکـدا لەگـەڵ منـدا بژیـت و تەنیـا بـە جەسـتە لەگـەڵ منـدا بیـت و ڕۆحیشـت لەگـەڵ کەسێکـی دیکـە بێـت؟
- کـە ئـەم ڕاسـتییە دەزانیـت، ئیـدی ئـازادم بکـە و بـا

چیتر بە درۆ ئەو جەستەیەشم لەگەڵ تۆدا نەمێنێت.
- تا من ماوم ئەوە بە چاوی خۆت نابینیت کە لە من جیابیتەوە، چونکە من هێشتە وەك شێت ئاشقی تۆم، تۆ لە ژیانی مندا بچیتەدەر، ئیدی منیش ناتوانم بژیم.
- بەڵام من چیدی ناتوانم لەگەڵ تۆدا بژیم و ئەو ئیشقەی لەگەڵ تۆدا هەمبوو، وردە وردە کاڵ بوومەوە و نەما، تۆش هۆکاری ئەوە بوویت.
- دەزانم ئێستە ئاشقی، ئەو هێشتە نازانێت واتای ئیشق و خۆشەویستی چییە، ئەو هێشتە بۆنی شیری خاو لە زاری دێتەدەر، حەز و سۆزێکی کاتیی فریوی داوە، کە لە جەستەت تێر بوو، ڕووی خۆیت لێ وەردەگێڕێت و هیچی لەبیر نامێنێت، ئەو تەنیا جارێ وەك ئاشق و شەیدا خۆی بە تۆ ناساندووە، پێدەچێت بەڵێنی پێدانی خانوومەکەشت پێدابێت، بۆیە ئێستەکە ڕۆڵی ئاشقێکی سەرسامت بۆ دەنوێنێت، بەڵام دوایی تۆ تا کۆتایی لەم خۆشییەدا نامێنیتەوە، کە هەموو مەرامەکانی خۆی لە تۆوە بەدەستهێنا، ئیدی پاڵێکت پێوە دەنێت و دەتخاتە سەر شەقام، بە خوا ئەوسا هیچ چارەیەکت نییە و منیشت نامێنێت، بۆیە دەبێت بگەڕێیتەوە یانەی شەوانی ئاسیاوی سوور، بە خوا تازە تەمەنیشت وەسەرکەوتووە، پێناچێت لەوێش وەرتبگرنەوە.

- قەیناکا تۆ ئازادم بکە، هەرچیم بەسەر دێت با لێم بێت، منیش بەو ژیانەی داهاتووی خۆم ڕازیم و خۆم هەڵمبژاردووە.. بە کۆتاییەکەشی هەر دڵخۆش دەبم.
- ئەمە ئەستەمە تا من بمێنم، وشەی تەڵاق و جیابوونەوە لە زاری من نابیستیت.
- باشە دەیبینین، منیش ڕێگەی دادگە دەگرم و بە یاسا مافی خۆم بەدەست دێنم.

* * *

ئومێد لەو کاتەوە باری دەروونی شڵەژاوە و بیر لەوە دەکاتەوە، کە تاکە چارسەری ئەو هەر ئەومیە کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت، بۆیە ورد و درشتی هەموو بەسەرهات و ڕووداوەکانی ڕابردووی بیردەکەوتەوە، لەو چرکەساتەشدا ئەوەی بیرکەوتەوە، کە تەواو بێزار بوو، بیری لە دەستدانی خاتوون ژیانی کارکردنیشی تێکدابوو، هەردەم لە داڵغە و هزران ڕادەچوو.
کاوە سەرسپی تاکە هاوڕێی خەمخۆری ئەو بوو، لە کتێبفرۆشاندا لە هەمووان پتر هاموشۆی دەکرد، گەلێك جاریش پێکەوە بۆ کتێب کڕین سەفەری بەغدا و موسڵ و سلێمانی و کەرکووکیان دەکرد. کاوەش هەستی بەوە دەکرد، کە ئومێد وەك جاران نییە، جارجارەش بۆ چەندان ڕۆژ لە شوێنی خۆی نایبینێت و شوێنی کتێبفرۆشییەکەی ڤالآیە، بۆیە بڕیاریدا لە نزیکەوە لێی بپرسێت و بزانێت چ باسە، بۆچی وەهای بەسەرهاتووە:
کاوە سەرسپی پیاوێکی زۆر بزێو و شەیتان بوو، کەس لێی نەدەبردەوە و فێڵی لێنەدەکرا، هەر شتێکی بیویستایە ڕایی دەکرد، بە هەچ ڕێگەیەك بووایە ئەنجامەکەی وەدەست دەهێنا، وەك میکاڤیلی وابوو، لەگەڵ ئەمەشدا کتێبانی زۆر دەخوێندەوە، لە خوێندنەوەشدا پتر بایەخی بە کتێبی هزری و سیاسی

و كۆمەڵایەتی و فەلسەفی دەدا، لە ماڵەوە زۆرینەی هەرە زۆری کتێبە قەدەخەکراوەکانی شاردبووەوە و کڕیاری تایبەتی خۆی هەبوو.

ئەو کە دەچووە بەغدا کتێبخانەکان متمانەیان پێی هەبوو، کتێبەکانی مارکس و لینین و ئەنگلز وماوتسی تۆنگ و گرامشی دەهێنا، تاکوو پێی بکرایە لە کتێبە هزرییەکان دریغی نەدەکرد، ئەوانیش بۆیان دەخستە ژێر کتێبەکانی سەرۆکی فەرماندە و کتێبەکانی حیزبی بەعس.

کە لەژێر دیواری دادگەش کتێبەکانی دادەنا، بە هەمان شت ئەو کتێبانەی دەخستە ژێر کتێبەکانی سەدام حوسێن و دەیشاردنەوە، هەروەها کتێبە کوردییە قەدەخەکراوەکانیشی لە کن هەبوون.

کاوە لەگەڵ ئەمەش کە لە بن دیواری دادگە و لەپاڵ ئومێد کتێبانی دەفرۆشت، بەڵام بە هۆی ئامۆزایەکییەوە، کە ناوی مووسا ئەبو شوارب بوو، خاوەن مەفرەزە تایبەتییەکان بوو، لە دائیرەی ئەمن دەستی دەڕۆیشت، بۆیە پشتیشی پێدەبەست لەوەش نەدەترسا کە بگیرێت، چونکە دەیزانی مووسا بەریدەدات، هەر ئەویش لە خانەی نیشتمانی دابەشکردن و بڵاوکردنەوەدا بریکاریی فرۆشتن و دابەشکردنی ڕۆژنامەکانی بۆ ناو شاری هەولێر بۆ وەرگرتبوو.

بەیانییان دەچووە خانەی نیشتمانی و ڕۆژنامە و گۆڤارمێلی عەرەبی و کوردی، کە لە بەغداوە دەهاتنە هەولێر و خانەی نیشتمانی، ئەویش بە خۆی و پاسکیلەکەیەوە، ئەم چاپەمەنییانەی دەگەیاندە کەسانی بەشداربوو.

دوای دابەشکردنی گۆڤار و ڕۆژنامە و کتێبان بەسەر بەشداربوواندا، دەهاتەوە بازاڕ و لەبن دیواری دادگە لەپاڵ ئومێد و شوان و عەلی و ئەمیر و پشتیوان کتێبەکانی لەبن دیوار و سەر شۆستە دادەنا.

ئەو ڕۆژەی کە ئومێد کێشەی لەگەڵ ئەو کوڕە گەنجە هەبوو کە ناوی ڕێدار بوو، ژیانی هاوسەری خستبووە مەترسییەوە، چۆنییەتی ئەو ڕووداوەی بۆ کاوە سەرسپی گێڕایەوە، تاکوو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە.

کاوە بیری لەوە کردەوە، بە هۆی لێدان و هەڕەشەوە چارەسەری بکات، ئەویش دەبێت مووسای ئامۆزای ڕاسپێرێت، بۆ ئەوەی پیاوەکانی بنێرێتە سەر ڕێگەی ئەو کوڕە و تەمبێی بکەن، تا بە هۆی ترس و هەڕەشەوە واز لە ژنەکەی بێنێت.

کاوە تەمەنی بیست و پێنج ساڵان بوو، هێشتە گەنج بوو، بەڵام سەری سپی بوو، ئەویش هەر لە بۆماوەییەوە بۆیان مابووەوە، خێزانەکەیان هەموویان بە گەنجی سەریان سپی دەبوو، لەگەڵ ئەمەش ئەو پیاوێکی دڵتەڕ و هی گەشت و سەیران و یانەی شەوانە بوو، هەموو

جار، کە لەگەڵ ئومێد دەچوونە بەغدا بۆ کتێب کڕین سەرێکیان بە یانەی شەوانەدا دەکرد، جاری واش هەبوو دەچوونە بەردەم سینەما نەسر لە شەقامی سەعدون، لەوێندەر زۆرینەی هەرە زۆری گەوادەکانیان دەناسی و جارجارە بە هۆی ئەوانەوە دەچوونە ڕابواردنی شەوانەی ماڵە لەشفرۆشەکان، هەندێکجار ڕایاندەبوارد و دەگەڕانەوە هۆتێل، جاری واش هەبوو شەوێکی تەواو تاکوو بەیانی لای ئافرەتێك دەمانەوە ئەگەر حەز و ئارەزوویان ویستبای.

کاوە بۆ ئومێد برادەر و پشت و پەناو هەموو شتێك بوو، بۆیە ئەرکی لێدان و تەمێکردنی ڕێداری بە مووسای ئامۆزای سپارد، ئەویش پیاوانی خۆی ناردە سەر ڕێگەی. ڕۆژێکیان بە نیوە مردوویی ناردیانە ماڵەوە، چەند ڕۆژێك ئەو کوڕە لەناو جێدا کەوت، کە تۆزێك چاك بووەوە براکانی، خزم و کەسوکاری خۆیان کۆکردەوە و خۆیان هاوێشتە ماڵی ئەحمەد سەرگەورە، چونکە ئەو گەورە پیاوی بنەماڵە و سەرۆکی عەشیرەتیان بوو، ئەویش لەسەر ئەو خزمانەی هاتە دەنگ و بەڵێنی پێدان تۆڵەی ڕێدار بکاتەوە.

ئەوانیش خزم و کەسوکاری خۆیان کۆکردەوە و تۆڵەیان لە ئومێد کردەوە، ڕۆژێکیان وەك نیمچە مردوویەك ناردیانە ماڵەوە.

کاتێ دائیرەی ئەمن زانی هەردوولایان بەرانبەر یەکدی بوونەتەوە، پشتگیری هەردوولاشیان پیاوانی خۆیانن، نەیانویست چیدی بکەونە وێزەی یەکدی نەوەك کێشەکە گەورەتر بێت و لە دەست دەربچێت، بۆیە بە دوای مووسا و ئەحمەدیان نارد و پێیانڕاگەیاندن، کە نابێت چیدی بەرەنگاری یەکدی ببنەوە و ناحەزانی دائیرەی ئەمن دڵیان بەم دوژمنداریيەی ئەوان خۆشبێت، بۆیە پێیانڕاگەیاندن، کە ئیدی کێشەکەیان لە ڕێی دادگەوە چارەسەر بکەن و جارێکی دیکە بەرنەبنە گیانی یەکدی، ئەوانیش ئەو بڕیارەیان دا.

خاتوون کە زانی لێدان و هەڕەشە نەما، ئەویش ڕێی دادگەی گرتەبەر و بە هۆی ڕێدارەوە بریکارنامەی بۆ پارێزەرێك واژۆ کرد و داوای یاسایی بۆ جیابوونەوەی لە ئومێد گەیاندە دادگەوە. پرۆسەی دادگەییەکە چەند دانیشتنێك بوو، بەڵام دواجار پارێزەرەکەی کەیسەکەی بردەوە، ئەگەرچی ئومێدیش پارێزەری هەبوو. پارێزەرەکەی خاتوون تێیگەیاندبوو، کە قازی چی لێدەپرسێت و ئەویش چۆن قسان بکات و وەڵامی بداتەوە.

لە یەکەمین دانیشتندا، حاکم لە خاتوونی پرسی:

- بۆچی داوای تەڵاق دەکەیت؟

- چونکە مێردەکەم پیاوەتی نەماوە.

- تۆ دڵنیایی؟

- بەڵێ، دەتوانن پشکنینی بۆ بکەن و بیزانن.

حاکم بۆ دڵنیابوون لە قسەکەی خاتوون، ئومێدی ڕەوانەی لیژنەی پزیشکی کرد.

لیژنەی پزیشکی پشکنینی خۆی کرد و بە ڕاپۆرتێک وەڵامی دادگەیان دایەوە.

لە دووەمین دانیشتندا دوای خوێندنەوەی بڕیاری لیژنەی پزیشکی و پرسیار و وەڵام، دوای ئەوەی هەر سێ حاکم ڕاوبۆچوونەکانی خۆیان مشتوماڵ کرد و هاتنەوە، بڕیاری دادگەیان خوێندەوە. بڕیاری جیابوونەوەی خاتوون و ئومێد بوو بە پاڵپشتی یاسا، بەمەش خاتوون زۆر دڵخۆش بوو، کە توانی بەڵگەی یاسایی تەڵاقدان بەدەستبێنێت.

دەبووایە ئومێد خانووەکە بۆ ڕێدار ڤاڵا بکات، کە خاتوون بە ناوی ئەوی کردبوو.

دوای چەند ڕۆژێک، لە ماڵی خوشکەکەیدا، ژووریکیان بۆ ئومێد ڕێکخست، ڤێجا هەموو کتێب و دەفتەر و کەلوپەل و شتانی خۆی بۆ ئەوێ گواستەوە.

هێندەی خاتوون خۆشدەویست، هێشتاکە بڕوای نەدەکرد لێی جیابووبێتەوە.

ڕێدار نەیتوانی بێ خاتوون ئۆقرە بگرێت، دوای ماوەیەکی کورت لە وەرگرتنی تەڵاقنامەی خاتوون،

خـۆی کۆکـردەوە و لـە هۆڵێکـی بـووک گواسـتنەوەدا ئاهەنگـی مارەبڕیـن و هاوسـەرگیری لـە هەمـان شـەودا سـازکرا، خانووەکـەی جارانـی خاتـوون، کـە بـە نـاوی ڕێـدارەوە کـرا، بـوو بـە شـوێنی مانگـی هەنگوینـی و ئارامگـەی پێکـەوە ژیانـی ئـەو دووانـە.

ئومێـد لـەم خانـووەدا وەدەرنـرا و دوورخرایـەوە، کـە لـە هەمـوو کەلێـن و قوژبـن و سوچێکیدا، لـە هەمـوو ژوور و گەرمـاو و ئاودەسـت و باخچەیـدا، لەگـەڵ هەمـوو بـەرد و داری خانووەکـەدا یادگارییەکانـی گرێدرابـوون، چەنـدان سـاڵی خۆشەویسـتی و پێکـەوە هاوسـەری و ژیانـی دەگـەڵ خاتووندا، هـەر لـەم ماڵـەدا پێکـەوە بەسـتبوونەوە، بۆیـە لـە ماڵـی نەسـرینی خوشـکیدا، ئـەو خـۆی بـە نامـۆ و غـەوارە دەهاتـە پێـش چـاو، ڕۆژ دوای ڕۆژ و سـات دوای سـاتیش پتـر لـە خـۆی ڕادەمـا و خـۆی دەخـواردەوە، بیرکردنـەوە لـە ژیانـی ڕابـردوو و خانووەکـەی پتـر بـاری دەروونییـان تێکـدەدا، ئەگەرچـی لـەم ماڵـە نوێیـەدا، کـە ئـەوی هاتووەتـە نـاوێ تەنیـا نەسـرینی خوشـکی و مێردەکـەی لـێ دەژیـان، کـە نـاوی هـاوڕێ بـوو، ئەویـش بـوو بـە سـێیەمین ئەندامـی ئـەم ماڵـە.

هـاوڕێ بـە نیـوە مـرۆڤ ئەژمـار دەکـرا، چونکـە ئیفلیـج بـوو و لەسـەر کورسـی بـوو.

ئومێـد ئـەو ڕۆژانـەی بیرهاتـەوە، کـە هـاوڕێ لـە

خۆپیشاندانەکان لە ڕیزی پێشەوە بوو، هوتافی دژی دیکتاتۆر دەدا و پیاوێکی ئازاو بە ورە و خوێن گەرم بوو، هەر کۆڵی نەدا، تاکوو ڕۆژێکیان لە دایەرەی ئەمن دەستگیرییان کرد، چونکە یەکێك لە هاوڕێکانی، کە لە شانەی نهێنی پێکەوە کاریان دەکرد دەستگیرکراو ناوی چەند کەسێکی ئاشکرا کردبوو، یەکێك لەو کەسانەش هاوڕێ بوو، بەڵام ئەو لەگەڵ ئەو ئەشکەنجە و فەلاقە و گوشاری دەروونی و لێدان و لە کارەبادان و بە پانکەوەکردن و بەستنەوەی لە سەربان لەبەر سەرما و باران هەر هیچی نەدرکاند و بەرگەی گرت، لەبەرئەوەی ئەو کۆمۆنیستێکی پڕ بیروباوەڕ بوو، لەگەڵ لێدان و ئازاردانیشی جار جارە دەیانویست بە قسەی خۆش لە خشتەی ببەن و قسەی پێبکەن بۆیە پێیاندەوت:

- ئەگەر دان بە پێوەندی نهێنی خۆتدا بنێیت و ناوی هاوڕێکانت بدەیت، ئەوا ئازادت دەکەین و دەتنێرینەوەماڵەکەی خۆت و دەشتپارێزین. تۆ تەنیا پاکانەیەك پڕ دەکەیتەوە، دوایش بۆ بەرژەوەندیی ئێمە لەگەڵماندا کار بکە و تۆ تەنها ڕاپۆرتمان بۆ بنووسە و ناشهێڵین هیچ کەسێك بە پێوەندیی تۆ بزانێت لەگەڵ ئێمەدا کار دەکەیت. لە بەرانبەر ئەم چاکەیەشدا حیزب و شۆڕشی ١٧- ٣٠ی تەمموزی پیرۆز چاوی بۆت کراوە

دەبێت و تۆڵەی چاکەکانت بۆ دەکاتەوە.
ئەو زۆر ئاقڵ بوو، بەم بەڵێنانە هەڵنەخەڵەتا، بۆیە ئەوان پتر کۆڵی دڵی خۆیان پێی هەڵدەڕشت، تا لەم لێدانە بەردەوامە چیدی پێیەکانی زەوی نەگرت و ئیفلیج بوو، دواتر دادگەیی کرا، حاکمی دادگەی ئەمن پێنج ساڵی بۆ بڕییەوە، بەڵام پێنج ساڵی زیندانی بەعس بە پێنج سەت ساڵ بوو، بەر لێبووردنێکی سەرۆکی فەرماندە کەوت و ئازادکرا..
دوای ڕاپەڕین فەهد و فریاد بەرگەی بێکاری و بارودۆخی نالەباری کوردستانیان نەگرت و بەو بڕە پارەیەی، کە کۆیان کردبووەوە خۆیان گەیاندە تورکیا، لەوێشەوە بەرەو ئەوروپا، دواجاریش لە ئەڵمانیا گیرسانەوە، مامۆستا نەسرینی دایکیان و هاوڕێی ئیفلیجی باوکیان لە ژیانێکی سەخت و لەو ڕەوشەدا جێهێشت، کە ئێستەکە ئومێدیش بووەتە ئەندامێکی ئەوماڵە.
ئومێد بوو بە بنیادەمێکی دیکە لەم دنیایە، هەردەم پەڕگیر و کەمدوو و تاقەت لێبڕاو، هەردەم خەیاڵاوی و دابڕاو لە دنیای دەوروبەر، هەردەم خۆی گرمۆڵە دەکرد و ڕۆژانی ڕابردووی لە بیر و هزرانی خۆیدا دەهێنا و دەبرد، هەردەم حەیران و سەراسیما بە لەدەستدانی خاتوون، دنیای لێ بوو بوو بە کونی دەرزی و هەستی

بـه خـۆی نەدەکـرد لەسـەر دنیـادا دەژی، بـگـرە وەك مردوویـەك لـە ئاوزینـگدانێـدا بێـت وابـوو، تەنهـا هەسـتی بـەوە دەکـرد وا جـارێ هەناسـە دەدات، بۆیـە لـەم دۆخـە دەروونییـە سـەختەدا وازی لـە شـیعر نووسـین هێنـا، چیـدی لەبـن دیـواری دادگەشـدا کتێبانـی ڕیـز نەکـرد و ئیـدی بـە لای خوێندنـەوەی کتێبیشـدا نەچـوو.
ئەگـەر سـەیری سـەر و ڕوخسـاریت بکردایـە، هەسـتت نەدەکـرد ئـەوە ئومێـد بێـت، بـگـرە کەسـێکی دیکەیـە هاتووەتـە نـاو جەسـتەی ئومێـدەوە، چونکـە ڕوخسـاری بـە تەواوەتـی گۆڕابـوو و قژیـژ، جلوبەرگـی بـێ ئوتـوو و گەچـڵاو و ناڕێـك، پـرچ و ڕیشـی تێکەڵـی یەکـدی بـوو بـوو، ئەگـەر بهاتایـە بـۆ نـاو بـازاڕ و منـداڵان بیاندیتایـە، وەك شـێت بـە دووی دەکەوتـن، وەلـێ ئـەو دوای ئـەم ڕووداوە چیـدی لـە ماڵـی نەسـرینی خوشـکی نەهاتـەدەرێ، گۆشـەگیری بـۆ خـۆی هەڵبـژارد و چاوەڕوانـی مردنـی دەکـرد، تـا دەرگـەی ڕزگاربوونـی لـەم ژیانـەدا لـێ بکاتـەوە و لـە دنیاکـەی دیکـەدا ئۆقـرە بگرێـت و بحەسـێتەوە.
ئـەو تەنیـا بـە سـەرەداوێکەوە پێوەندیـی بـە ژیانـەوە مابـوو، بـگـرە مردوویـەك بـوو بـۆ خـۆی، بـەڵام هێشـتە گیانـی لـە جەسـتەی جیـا نەبـوو بـووەوە، ئـەو لاشـەیەکی بـێ گیـان بـوو، مەلێـك بـوو بـێ پـەڕ و بـاڵ.

(٣)

ئومێد خۆشەویستییەکەی خۆی، لەگەڵ خۆشەویستی کاوە سەرسپی بەراوەرد دەکرد، ئەو خۆشەویستەکەی لە دەستدا و بەجێی هێشت و لێی جیابووەوە، بوو بە هاوسەر و خۆشەویستی یەکێکی دیکە، کە نزیکەی چواردە ساڵ لە خۆی بچووکتر بوو. هەرچی کاوەشە خۆشەویستییەکەی لە دەست نەدا، بەڵام بە هۆی نەخۆشییەکەوە، کە پێیان دەگوت (m. s) ماڵئاوایی لە ژیان کرد و کاوەی دەرگیری خەم و کۆڤانێکی دیکە کرد، کە چۆن ئەو دوو کوڕ و تاقە کچەی لە دوای مەروە هیلالی بەجێمان، بتوانێت پەروەردەیان ڕابگرێت و گەورەیان بکات، ئەگەرچی منداڵەکانی گەورە بوون و لە خەم چووبوونەدەر.

مەروان کوڕە گەورەی بوو، تەمەنی هەژدە ساڵان بوو، پۆلی شەشی ئامادەیی بوو، دەبووایە ئەمساڵە بخوێنێت تا

نمرەی باش بەدەست بێنێت و بچێتە کۆلێژی پزیشکی.
ئەو ناوەکەی عارەبی بوو، دایکی ئەو ناوەی لێنا، کاوەش دڵی نەشکاند، وای دەخواست بارودۆخێکی ئارامی لەوماڵەدا بۆ بڕەخسێنێت، تاکوو بتوانێت باش هەوڵ بدات.
سیروان دووەمین کوڕی کاوە سەرسپی بوو، دوو ساڵ لە مەروان بچووکتر بوو، تەمەنی شازدە ساڵان بوو، پۆلی چواری ئامادەیی بوو، هەردووکیان لە ئامادەیی کوردستاندا قوتابی بوون، سیروان ناوەکەی کوردی بوو، چونکە ئەویان باوکی ناوی لێنا، تا لەگەڵ مەروە هاوسان بن، لەناو لێنانی دوو کوڕیاندا یەکێکیان بۆ ئەو، ئەوی دیشیان بۆ ئەوی دیکە.
کچەکەشیان کە ناوی سەراب بوو، لە پۆلی سێی ناوەندی بوو، ئەویان ناوەکەی هاوبەش بوو لە نێوان کوردی و عارەباندا، چونکە هەم کورد، هەمیش عارەبان ئەو ناوە لە منداڵەکانیان دەنێن.
ئومێد بەراوردی ئەوەشی کرد، لە نێوان خۆی و کاوەدا، پێی سەیر بوو، لە دڵی خۆیدا وتی (ئەم دنیایە چەندە سەیرە، هەردووکمان دوو ئافرەتمان لە دەرەوەی کوردستان خۆشویست، من لە بەغدا خۆشەویستی خۆم دۆزییەوە و بوو بە هاوسەرم، کاوەش لە بەسرە، ئەو بە هۆی نەخۆشییەوە کۆچی

کرد و جیێ هێشت و لێکدی دابڕان، بەڵام هی من جۆرێکی دیکە بوو، خاتوون خۆشەویستی منی نایە ژێر پێیەکانی و کەسێکی دیکەی خۆشویست و لێم جیابووەوە)

جیاوازییەکی دیکەیشیان هەبوو کە کاوە سێ منداڵی لە هاوژینەکەی هەبوو، بەڵام خاتوون هیچ منداڵی نەبوو، تاکوو پێکەوەیان ببەستێتەوە. دوایی هەر خۆی لەم بەراوردەدا پێی باش بوو، کە ئەو لەگەڵ خاتوون هیچ منداڵییان نەبووە، دەنا دوای دابڕانی ئەوان، منداڵەکان چییان دەکرد و چۆن دەژیان و چارەنووسییان چی دەبوو.

* * *

لەو کاتەدا ئەو هێشتاکە لە سەربان بوو، هێشتە کۆتایی بە ژیانی خۆی نەهێنابوو، وردە وردە ڕووداوەکانی ڕابردووی وازیان لێ نەدەهێنا. بلەز هەموو ڕابردووی بیردەکەوتەوە، ئەو دوو ڕێکەوتەی پێ سەیر بوو، کە خۆی و کاوەی هاوڕێی بوون بە خۆشەویستی دوو ئافرەت لە دەرەوەی هەولێر، هی خۆی هێشتە پێ باشتر بوو، کە بە هۆی هاتوچۆی یانەی شەوانەی ئاسیاوی سوورەوە خاتوونی ناسی و خۆشی ویست، بەڵام کاوە لە بەسرە خۆشەویستی خۆی دۆزییەوە، کاوە سەربردەی خۆشەویستی خۆی بە دوورودرێژی بۆ گێڕابوووە، بۆیە هەموو شتێکی لەبارەی ژیانی کاوە دەزانی، بیری هاتەوە لەسەر قەڵاتی هەولێرەوە، چیرۆکی ڤینی کاوە و مەروە دەستی پێکرد، ئەو دیمەنەی کاوە بۆی گێڕایەوە هاتەوە یادی.

لە نزیک دەرگەی قەڵا بوو، دەیویست بچێتە سەر قەڵا و شوێنەوارە کۆنەکانی قەڵا بەسەر بکاتەوە، ئەوانیش پیاوێك و ژنێك و کچێك لە بەسرەوە هاتبوونە هەولێر، لەناو قەیسەرییەوە دەستیان پێکردبوو، پێیدا ڕۆیشتن و حەزیان دەکرد قەڵای هەولێر بەسەر بکەنەوە، چونکە لە کتێبی خوێندنی جوگرافیا و مێژوودا شتێکیان لەبارەی هەولێرەوە دەزانی، بەڵام حەزیان

دەکـرد بـە چـاوی خۆیـان ببینـن، تاکـوو کـە چوونـەوە بەسـرە بێـژن چووینـە قـەڵا و شـوێنەوارە کۆنەکانمـان بینیـووە.

لـەو دەمەیـڕا کاوە نزیکـی ئـەوان دەبێت، مـەروە بە جـۆری پۆشـینی جلەکانییـەوە سـەرنجی چەنـد گەنجێکـی گێرمشـێوێن ڕادەکێشـێت و جوانییەکـەی سەرسـامیان دەکات، بۆیـە بـە قسـە و توانـج و فیکـە لێـدان دوایـان دەکـەون، ئـەو پیـاوەی لەگەڵیاندایـە لـە بەرانبەریانـدا دەوەسـتێت و هـاوار دەکات:

- وخـروا گواویـد ولکـم مـا تعرفـون منـو أنـا، أذا مـا تعرفـون أراولکـم مـن أنـا.

واتە:

- گەوادینـە دوور بکەونـەوە، هێشـتە نەتانزانیـوە مـن کێـم، ئەگـەر نازانـن ئـەوا پیشـانتان دەدەم، کـە مـن کێـم.

ئەوانیـش وازیـان لێناهێنـن و تێـی ناگـەن. کاوە ئـەو دەمـە لـە نزیکیـان دەبێـت و ئـەوان ڕووی تێدەکـەن و یەکێکیـان بـە کاوە دەبێژێـت:

- کاکـە ئەمەمـان بـۆ بکـە بـە کـوردی بزانـە ئـەو خوشـك حیـزە چـی دەڵێـت؟

کاوە بە تەنها دەرەقەتیـان نایـەت، بـەڵام داوا لـە کەسـانی دەوروبـەر دەکات، تاکـوو ئـەو گەنجـە سـەرڕۆیانە لـە

كۆڵ ئەو میوانانەی شار بكەنەوە.
خەڵكەكە دەبنە ناوبژیوان، كاوەش شەڕەكە دەكاتە هی خۆی، ئەوجارە پیاوەكە ڕوو لە كاوە دەكات، بەڵام ئاڕاستەی قسەی بۆ ئەوان بوو و تی:
- گلهم، گلهم، أنا ما أخاف منهم لو یجون میت واحد منهم، أنا أسمي صدام السبتي مشهور بالبصرة كله.
واتە:
- پێیان بڵێ، پێیان بڵێ، من بە هیچ ئاوایەك لێیان ناترسم، تەنانەت سەد كەسیشیان بۆم بێن، من ناوم سەدام ئەلسبتییە لە هەموو بەسرەدا من بەناوبانگم و دەمناسن.
كاوەش قسەكەی بۆ وەرگێڕان و تێیگەیاندن، كە چییان پێدەڵێت.. ئیدی بە هۆی خەڵكی میواندۆست پەرتە بەو گەنجە سەرەڕۆیانە دەكەن.
كاوە خۆی دەناسێنێت، ئەوانیش خۆیانی پێدەناسێنن.
هەروە لەو دەمانەدا نیگای خستبووە سەر كاوە و سەرنجی ڕادەكێشێت، ڤێجا لەگەڵیاندا دەچێتە سەر قەلا، دەبن بە هاوڕێ، دواتر دەزانێت ئەو كچەی نیگای تێبڕیوە خوارزای ئەو پیاوەیە، كە ناوی (سەدام سبتی)یە.
كاوە میوانەكانی جێناهێڵێت و داوەتی ماڵی خۆیان دەكات و بە دایك و باوك و خوشك و براكانی خۆیان

دەناسێنێت، ئەوانیش بە ڕووخۆشییەوە میواندارییەکی جوانیان دەکەن، کە دەڕۆن ناونیشانی خۆیان دەدەن بە کەسوکاری کاوە.

ئومێد لەم چیرۆکەدا ئەو ڕێکەوتەی پێ سەیر بوو، بڕوای بەوە هەبوو، کە هەموو شتێك لە دنیادا چارەنووس و ڕێکەوتە، چیرۆکی ژیانی کاوش ئەم ڕێکەوت و چارەنووسە بوو، کە زۆر لە ژیانی ئەو دەچوو، بۆیە لەم دۆخەشدا ئومێد کەوتبووە ناو دنیای بیرکردنەوە و کۆتایی هێنان بە ژیانی خۆی، کەچی هێشتە ئەو دیمەنانەی ڕابردووی یەکە یەکە دەهاتنەوە بەرچاوی.

* * *

لە دیمەنێکی دیکەدا ئەوەی بە بیرهاتەوە، کە کاوە لە تەنیشت ئەو لەبن دیواری دادگەدا کتێبیان پێکەوە دەفرۆشت، دواتر دەیویست لە فەرمانگەیەکی میریدا دابمەزرێت، تاکوو تۆزێك لە مەینەتی بێکاری و سستی بازاڕی کتێب پشوویەك بدات، هەر هیچ نەبێت ببێت بە فەرمانبەری میری و کاتەکانی دوای دەوامیش کتێبفرۆشی خۆی بکات.

زۆر هەوڵیدا، بەڵام حکوومەتی بەعس کەسی لە کوردستان دانەدەمەزراند، پاشان لە ڕێگەی برادەرێکییەوە زانی، کە حکوومەت بە دامەزراندنی ناوەندییەوە لە بەغدا کوردان لە خوارووی عێراق دادەمەزرێنێت، ئەو دەمە سالانی دوای نسکۆی شۆڕشی کورد بوو، ئەوەی دەهاتەوە لە شاخ و چەکی پێشمەرگایەتیی دادەنا، یان وازی لە پێشمەرگایەتیی دەهێنا، بە تایبەتی ئەوانەی بە خێزانەوە دەهاتنەوە، دەیاننـاردن بۆ شارەکانی خوارووی عێراق، لەوێش پیاو و گەنجانیان لە فەرمانگەکانی میری دادەمەزراند، ئەمەشیان بۆ گۆڕینی دیموگرافیای شارەکانی کوردستان بوو، کە کوردی دەبردنە خواروو و عارەبانیشیان دەهێنایە کوردستان، بە تایبەتی لە شارەکانی کەرکووك و خانەقین و مەندەلی و گەرمیان و دەوروبەری موسڵ، تاکوو خەڵکی ئێمە

تێکـەڵ داب و نەریـت و زمانـی ئـەوان بێـت و وردە وردە هەسـتی نەتەوەیـی کـورد خامـۆش بکـەن، بـۆ ئـەوەی عارەبانیـش ببنـە زۆرینـە، لـەو شـارانەی لـە نێـوان شـۆڕشـی کورد و حکوومەتە یەك بەدوای یەکەکانی عێراقدا کێشـەیان لەسـەر بـوو.

ئـەو سـاڵانەی دوای نسـکۆ، حیزبـی بەعـس بڕیـاری دامەزراندنـی مەرکـەزی دەرکـرد بـۆ هەمـوو پارێزگەکانـی عێـراق لـە بەغـداوە خەڵك لـە پایتەخـت و شـارەکانی عێـراق دادەمـەزرا، مـەرج نەبوو هـەر کەسـە لـە شـاری خـۆی دابمەزرێـت، بەڵکـو لـە کـوێ و لـە چ شـارێك پێویسـتیان بووایـە بـۆ ئەوێـان دەنـارد.

کاوە ئەو کاتەی ئەو زانیارییـەی لـە هاوڕێیەکـی خـۆی وەرگـرت، دەنـا نەیدەزانـی دامەزرانـدن مەرکەزییـە.

ڕۆژێکیـان لەگـەڵ کاروانـی هاوڕێـی، چـوون بـۆ بەغـدا، داواکاری دامەزراندنیـان پێشـکەش کـرد، ئـەو سـاڵە سـاڵی ١٩٧٧ بـوو، هەردووکیـان دەرچـووی ئامادەیـی کشـتوکاڵ بـوون.

دوای چەنـد مانگێك هەواڵـی دامەزراندنیـان بـۆ نێردرایـە هەولێـر و لـە کارگـەی کاخـەزی مەجـەر لـە بەسـرە دامـەزران.

ئـەو دوو بـرادەرە پێکـەوە چوونـە بەغـدا، لەوێشـەوە گەراجی عەلاوی و بۆ بەسرە بارگە و جانتایان پێچایەوە.

پێوەندییان بە کارگەوە کرد و دەستبەکاربوون، ماوەیەك لە ئۆتێل بوون، دوایی شوقەیەکیان لە بەسرە بەکرێ گرت.

مەجەر نیو دەمژمێران لە بەسرەوە دوور بوو، ئەو کاتە گەورەترین کارگەی کاخەز بوو لە عێراقدا.

بە پاسێك کە فەرمانگەکە بۆی دابین کردن دەیبردنە کارگە و دوای کۆتایی هاتنی دەوامیش دەهاتنەوە بەسرە.

ئەو ڕۆژەی کاوە و کاروان چوونە کارگەی کاخەز و فەرمانی دامەزراندنەکەیان دایە دەست بەڕێوەبەر، دواییش بەرپرسی پێوەندییەکان هەردووکیانی بە فەرمانبەران و کارمەندانی کارگە ناساند، کە گەیشتنە ژووری خۆیەتی، کاوە یەکسەر نیگای کەوتە سەر مەروە هیلالی، کە لە هەولێر لە ڕووداوەکەی قەڵات یەکدییان ناسی و هەستیان کەوتبووە سەر یەکدی، کە یەکدییان بینی هەردووکیان شاگەشکە بوون، کاوە بڕوای نەدەکرد ئەوی دەیبینێت مەروە هیلالی بێت، لە یەك چرکەساتدا هەردووکیان ئەو ڕۆژەی هەولێریان بیرهاتەوە، کە نزیك دەرگەی قەڵا بە هۆی گێچەڵی چەند گەنجێکی گێرەشێوێن یەکدییان ناسی و یەکەمین تیشکی ڕالێبوون و سەرسامبوون کەوتە

ناو دڵی هەردووکیان.
ئەمجارەش ڕێکەوتێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، بڕوایان نەدەکرد ئەوەی بە چاوی خۆیان دەیبینن ڕاست بێت، ئاخر مەروە لە ئاسماندا منەی کاوەی دەکرد، وا لەسەر زەوی دۆزییەوە.
مەروە ئەبڵەق بوو، چی ئەو کوڕەی بۆ ئەو هێنایە بەسرە، لە بەسرەش چۆن بە ڕێکەوت کار و دامەزراندنی کەوتە ئەم کارگەی کاخەزە، کە ئەو کاری تێدا دەکرد.
مەروە هێشتە پەیمانی خۆشەویستی بە کەس نەدابوو، دڵیشی بۆ هیچ کوڕێك لێی نەدابوو، ئیدی ئەو کوڕەی کە یەکەمین جار و لە یەکەمین نیگادا دڵی لێسەند و بۆی کەوتە خورپە، وا چارەنووس بۆ لای ئەو ڕاپێچی کردووە و هێناویەتە شارەکەیان، لە شارەکەشیاندا یەکڕێ بۆ کارگەی ئەوان.
مەروە زانی کاوە بە هۆی بڕیاری مەرکەزیبوونی دامەزراندنی حیزبی بەعسەوە، ڕێکەوت هێناویەتی بۆ شارەکەی ئەوان، لەوەش ڕێکەوتتر بۆ فەرمانگەی ئەوان، زانی ئەو کوڕە پێویستی بە کاربووە و لە شاری خۆیان دانەمەزراوە، چیدی نەیتوانیوە تەنها بە کتێبفرۆشییەوە بتوانێت بژییەت.
لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە و وتی (ئاخر ئەگەر

ناچاری نەبێت، ئەو كوڕە بۆچی لەوسەری دنیاوە بۆ ئەمسەری دنیا بازی داوە، ئاخر ماوەی نێوان هەولێر و بەسرە بە ئۆتۆمبێل ئەگەر لە ڕێگەدا تەنیا دوو سێ جار پشوو بدەن لە بەیانییەوە دەبێت سواری ئۆتۆمبێل بێت و دوای نزیك ئێوارێ دەگەیتەجێ)

مەروە چۆنییەتی ئەم یەكدی ناسینەی لەگەڵ كاوە بۆ بەڕێوەبەری كارخانە گێڕایەوە، دوایی لەسەر داوای ئەو كاویان لە ژوورەكەی دانا، كاروانیش بۆ بەشی بەرهەمهێنان.

لەو دەمەوە مەروە و كاوە بوونە دڵدار و دڵخوازی یەكدی و كارمەندانی كارگەش هەستیان بەم پێوەندییەی ئەوان دەكرد.

كاوە و مەروە بیریان لە هاوسەرگیری كردەوە، بەڵام ئەوەی ڕێگر بوو تەنها دووری نێوان هەولێر و بەسرە نەبوو، بوونی دوو نەتەوەی جیاواز و دوو زمانی جیاوازیش نەبوو، بەڵكو پەرژینی نێوانیان تەنها جیاوازی ئایینی نێوانیان بوو، ئەگەرچی هەردووكیان گیرۆدە و پابەندی ئایین و داب و نەریت نەبوون، بەڵام كەسوكاری مەروە، بە تایبەتیش خاڵەكانی زۆر گۆشەگیر و پابەندی ئایینی خۆیان بوون، لەبەر هەندێ ڕێگەیان بە هاوسەرگیری خۆیان و ئایینەكانی دیكە نەدەدا، بە تایبەتیش سەدام ئەلسبتی خاڵی گەورەی مەروە،

ئاخر ئەوان ئایینەکەیان زۆر داخراو بوو، وردە وردەش ژمارەیان لە شارەکانی عێراق کەم دەبووەوە.
ئەوان کە سابئە و مەندائی بوون، لە چەندان شار و شارۆکە و شوێنی دیاریکراوی عێراقدا دەژیان و لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا جیاواز بوون.
کاوە چوو بۆ داخوازی مەروە، بەڵام هەموو کەسوکاری ڕازی نەبوون.
دایک و باوکی پێیان ناخۆش بوو، کە چۆن دەبێت کچەکەیان بدەنە کوردێك و لە خۆیانی دووربخەنەوە، چونکە دەیانزانی کاوە تا سەر لە بەسرە نامێنێتەوە، ڕۆژێك دادێ دەچێتەوە کوردستان و کچەکەی ئەوانیش لەگەڵ خۆیدا دەبات، ئەوسا ئەوانیش مەگەر تەنیا بە تەلەفۆن هەواڵی کچەکەیان بزانن، دەنا لێیان دادەبڕێت، مەگەر ڕێکەوتێك هەبێت جار جارە بچێتەوە لایان.
لەگەڵ ئەمەش لەبەر دڵی کچەکەیان کە بە دایکی وتبوو: (بیدەنێ هەر ئەو کوڕەیە و نەشیدەنێ هەر ئەوە)
ئیدی هەردووکیان بە ئەوینی کچەکەیان زانی، بەڵام ئەوانەی کە نەدەهاتنە ڕایێ خاڵەکانی بوون.
کاوە یەكساڵی ڕەبەق دانوستاندنی لەگەڵدا کردن، کە زانییان چی دیکە ناکارن ببنە بەربەست لە

بەردەمیـان، مـەروەش هەڕەشـەی ئـەوەی لێکردبـوون، ئەگـەر ئـەو بۆ کاوە نەبێت، دەبێ ئیدی لـە گۆڕەکەیدا سـەردانی بکـەن.
ئەوانیـش کـە زانیـان هیـچ چارەی دیکەیـان نییـە، بـە ناچـاری ڕێگەیـان بـە هاوسـەرگیرییان دا.
ئەمجـارە کێشـەکە گەیشـتە هەولێـر، چونکـە کـە گەڕایـەوە لەگـەڵ دایـك و باوکـی باسـی ئـەم بابەتـەی کـرد و داوای لێکـردن بـۆی بچنـە داخـوازی مـەروە.
ئـەوان بـە مـام و خاڵەکانـی کاوەیـان گـوت، ئەمجـارە دایـك و باوکـی دژی ئـەو هاوسـەرگیرییە نەبـوون، چونکـە حەزیـان دەکـرد کوڕەکەیـان بـە دڵـی خـۆی کێـی پـێ بـاش بێـت ئـەو هاوسـەری بێـت و نەیاندەویسـت ببنـە بەربەسـت لەبـەردەم بەختـەوەری کوڕەکەیـان.
حاجـی کاکـۆی مامـی گـەورەی لـەم هاوسـەرگیرییەدا ڕێگریـوو، چونکـە ئـەو حـەزی دەکـرد کاوە بکاتـە زاوای خـۆی و بیهێنێتـەوە هەولێـر، بۆیـە کـە باسـی ئـەو بابەتـە دەکـرا حاجـی کاکـۆ پێـی دەوتـن:
- بۆچـی کـەس نەمابـوو لێـرە تـا کاوە ببێتـە زاوای بەسـرەییان، بۆچـی ژنـی ئێـرە چییەتـی؟ پێـم باشـە پاروەکـە بکەوێتـە کۆشـی خۆمـان.
دایك و باوکی کاوەش وەها بەرسڤیان دەدایەوە:
- ئاخـر ئـەو دڵـی لەگـەڵ ئـەو کچـەدا گۆڕیوەتـەوە و

دڵیش هیچی لەگەڵدا ناکرێت، هاوسەرگیری بە خورتی نابێت.
- کێ دەڵێت لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانەدا بەختەوەر دەبێت؟
- هەردووکیان پەیمانی خۆشەویستییان بە یەکدی داوە و ئەوان خۆشەویستی یەکدین لەگەڵ یەکدی ئاسوودە دەبن.
- بەڵام!
- بەڵام چی، دەتەوێت چی بڵێیت؟
- ئەو کچە لەسەر ئایینی ئێمە نییە و نابێت.
- بۆ نابێت هەریەکەیان لەسەر ئایینی خۆی، کەسوکاریشی بەمە ڕازین.
- با کەسوکاریشی مەیلیان لێبێت، بەڵام ئێمە موسڵمان و ئەوانیش سابیئەن، ئایینمان جیاوازە چۆن دەبێت؟
- هەر کەسە دینی خۆی، دواییش ئەو ئافرەتە بە تەنیا ناتوانێت لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە، بێ ئەوەی کەسێك بە تۆبزی ئایینەکەی پێ بگۆڕێت، ئەو خۆی دێتە سەر ئایینی ئێمە.
- ئاخر نابێت، با پێش گواستنەوە ببێتە موسڵمان، ئێمەش بە شەرع و دەستووری ئیسلام مارەی دەکەین.
کاوە ئەو کاتە زۆر لەم گوتویژە پەست بوو، بۆیە بە تووڕەییەوە لێیان هاتە دەنگ و پێی وتن:

- من و مەروە لەسەر هەموو شتێك ڕێكەوتووین و بڕیاری كۆتایی بۆ ئەوە، دەتوانێت ببێتە موسڵمان و دەشتوانێت هەر لەسەر ئاینی خۆی بمێنێتەوە، ئەوە بە ئارەزووی خۆی دەبێت، جارێ تەنیا هەندێكتان لەگەڵمدا بێن بۆ بەسرە، دەچین بۆ داخوازی و داوای خزمایەتییان لێدەكەین.

چەند كەسێك دەستنیشانكرا، تاكوو بچنە بەسرە و داخوازی مەروە لە كەسوكاری بكەن، دوای داخوازیكردنیش ڕۆژی پاشتر ئاهەنگێكی خنجیلانەیان لە هۆڵی ئوتێلێكدا بۆ ڕێكخست و بووكیان گواستەوە، شەویش بردنیان بۆ شوقەكەی كاوە و كاروان. ڕۆژی پاشتر بووك و زاوایان بەجێهێشت و گەڕانەوە هەولێر.

لەناو خزم و كەسوكاری كاوەدا یەك تاكە هاوڕێی هاتبوو، ئەویش ئومێد بوو، چونكە لە هاوسەرگیری ئومێد و خاتوونیشدا كاوە وەك تاكە هاوڕێی ئومێد لەگەڵیدا چووبوو.

كاوە و مەروە چوار ساڵ لە بەسرە مانەوە تا ساڵی ١٩٨١ بارودۆخی عێراق بە جۆرێكی دیكە گۆڕا و حكوومەتی بەعس لەم ساڵەدا بڕیارێكی دیكەی دەركرد، بە گوێرەی ئەم بڕیارە ئەو كوردانەی، كە لە خوارووی عێراق بوون و دامەزرابوون دەیانتوانی

بگەڕێنەوە شارەکانی خۆیان.
ئەم بڕیارە بۆ هەموویان دڵخۆشکەر بوو، بە تایبەتی بۆ کاوە، بۆیە توانی لەگەڵ مەروە ڕێك بکەوێت و بگەڕێتەوە هەولێر، ئەویش بە خۆشی و بێ کێشە لەگەڵیدا بچێت.
کاوە و کاروان داواکاری گواستنەومیان پێشکێش فەرمانگەکەیان کرد بۆ هەولێر، فەرمانگە ئەم بڕیارەی میرییان لابوو داواکارییەکانیان بۆ وەزارەتی پیشەسازی و کانەکان بەرزکردەوە.
دوای چەند ڕۆژێك فەرمانی گواستنەومیان دەرچوو، پێکەوە جانتای سەفەریان بۆ هەولێر پێچایەوە.
کاوە، مەروەی لەگەڵ خۆیدا نەبردە هەولێر، بەڵکو جارێ لە ماڵی باوکی مایەوە، تاکوو لە هەولێر خۆی ڕێکبخات و دوایی بێ کێشە بیبات.
مەروە پێی وتبوو: بڕۆ تۆ لە هەولێر خۆت ڕێکبخە و ماڵێکمان بۆ پێکەوە بنێ، ئەوسا مۆڵەتێك وەربگرە و سەفەرێك بکە و وەرە من و منداڵەکانیشمان ئامادەین، ئەوسا منیش کاری خۆم دەگوازمەوە بۆ هەولێر و هیچ کێشەکمان نابێت.
کاوە و مەروە تا لە بەسرە بوون، دوو کوڕیان هەبوو، مەروان و سیروان، دواییش کە هاتنەوە هەولێر کچێکیان بوو ناویان لێنا سەراب.

کاوە و کاروان گواسترانەوە بۆ کارگەی چێکردنی شەراب لە شارۆکەی هەریر. ئەم کارگەیە بولگارییەکان دروستیان کرد، سەر بە وەزارەتی پیشەسازی بوو لە بەغدا. کارگەکە تا ڕاپەڕین مابوو، لە دوایی کردیان بە کارگەی ئاوی تەماتەی هەریر.

دوای ساڵێك کارکردن لەو کارگەیە، ئەوان تازە توانیبوویان خانووێکی چکۆلانە بۆ خۆیان بکڕن و تێیدا بحەسێنەوە، بەڵام هێشتاکە چێژیان لە ژیان وەرنەگرتبوو، چونکە زۆر خەریك بوون تا توانیان مەروە بگوازنەوە بۆ هەولێر، دوای هەموو هەوڵێك مەروە کەوتە کارگەی ڕستن و چنینی هەولێر.

هێشتا تەواو ئۆخەیان لە ژیان نەکردبوو، لە هەولێر تێر نەبوو بوون، کە کاوە ناوی سەربازی هات و دوایی بە نادڵییەوە بەرەو پیری سەربازی چوو، سەردانی فەرمانگەی سەربازگری کرد، وەك سەرباز ڕەوانەی کەرکووکیان کرد، لەوێش مانگێك مایەوە، دوایی ڕەوانەی مۆزەخانەی سەربازییان کرد لە کۆڕنیشی ئەعزەمییە، لە بەغدا.

کاوە لە کاتی پشووی لە مۆزەخانەدا، دەگەڕایەوە ژوورەکەی خۆی لە ئوتێل نزار، کە لە شەقامی ڕەشید بوو، نزیك مەیدان.

ئەو توانی سوود لە شوێن و کاتی پشووی سەربازییەکەی وەربگرێت، سەرەڕێش لە دوای کاری مۆزەخانەی سەربازی، دەگەڕایەوە ئوتێل و ماوەیەك پشووی دەدا، ئینجا لە ئوتێل دەهاتە خوارەوە، بە پیاسە وردە وردە بە شەقامی ڕەشیددا پیاسەی دەکرد، پاشان بەرەو لای شەقامی موتەنەبی پێچی دەکردەوە، یەکە یەکە کتێبفرۆشەکانی سەر شۆستەی ئەو بازاڕەی بەسەر دەکردەوە، بە دووی کتێبی کۆن و دانسقەدا دەگەڕا، ئینجا بە دووکانەکانی قەیسەری ناو شەقامی موتەنەبیدا هەڵگێڕ و وەرگێڕی کتێبانی ئەو دوکانانەشی دەکرد.

دوایی لە کۆڵانەکە دەهاتە دەرەوە، دەپەڕییەوە ئەوبەری شەقامەکە، بەرەو لای شەقامی کچان، یاخۆ شەقامی نەهر چاوەکانی خۆی بە کچە جوانەکانی بەغدا ڕۆشن دەکردەوە، لەوسەرەوەش دەگەیشتەوە شەقامی ڕەشید و نزیك حافز قازی دەگەیشتە هەمبەرگەری ئەبو یۆنان، بە لەزەتەوە هەمبەرگەرێکی دەخوارد، لەولاتریشەوە شەربەتێکی ئەبو زبالەی بەسەردا دەکرد، ماوەیەکی دیکە دەڕۆیشت تا دەگەیشتە گۆڕەپانی تەحریر و بەرەو شەقامی سەعدون دەڕۆیشت، لە سەرەتای ئەو شەقامەوە تێکەڵ بە کتێبخانەکانی ئەوێ دەبوو.

ئەگەرچی سەربازیش بوو، بەڵام لەبەرئەوەی لە بەغدا بوو، بۆ ئەو زۆر گرینگ بوو، بەو پێیەی دەیتوانی تەنانەت سوود لە کاتەکانیشی وەربگرێت، بەمەیش کتێبی باش و دانسقەی دەست دەکەوت، کاتێك بە مۆڵەت دەگەڕایەوە هەولێر ئەو چەند ڕۆژەی مۆڵەتی هەبوو کتێبەکانی لەبن دیواری دادگە دادەنا.

ئەو جار جارە ئەگەر کتێبی چەند دانەش هەبووایە بۆ ئومێدیشی دەهێنا و پێکەوە کێبەرکێی کتێبفرۆشانی بن دیواری قەڵا و بن دیواری دادگەیان دەکرد.

کاوە و ئومێد پتر کتێبی مارکسی و فەلسەفییان دەهێنا و لەبن کتێبەکانی سەدام حوسێندا دەیانشاردنەوە و دەیاندایە کڕیاری تایبەتی خۆیان و ئەو کەسانەی کە جێی متمانە بوون.

* * *

ئەوجارە ئومێد سەربازی خۆی هاتەوە بیر، کە چۆن لێی بوو بە مۆتەکە. ئەو کاتەی لە جەنگی عێراق- ئێراندا بۆ سەربازی یەدەك بانگیان کرد، چونکە لەدایکبووی ساڵی ١٩٥٦ بوو، ماوەیەك لە سەربازگەی مەشق و ڕاهێنانی هەولێر مایەوە، پاشان لەگەڵ ژمارەیەك سەربازێکی دیکە گواسترانەوە بۆ لیوای پیادەی ٤٢٤، لەوێش بۆ فەوجی سێی ئەم لیوایە. بنکەی لیوا لە خەفاجیە بوو، فەوجەکانیش هەریەکەیان لە لایەکی دیکە بوو، دوایی لە گەرمەی شەڕدا گواسترانەومو فەوجەکەی ئەوان کەوتە نزیك قەسری شیرین.

لە هێرشێکی سوپای عێراق بۆ قەسری شیرین ئەو شارە گیرا و خەڵکەکەی هەموو دەربەدەر بوون، زۆر لە خانوو و بازاڕەکانیان وێرانکران، چەندان کەسیشیان کوژران، شارەکە وەك شارێکی وێران و بێ دانیشتووان بوو، تەنیا سەتا دەی خەڵکەکەی تێدا مابوومەوە، بە تەواوی کەوتبووە دەست سوپای عێراقەوە، ئەو خانووانەش کە مابوونەوە و نەڕووخابوون. سوپای عێراق بە دڕندەترین شێوە تاڵانیان کرد.

ئومێد دەیەویست بە هەچ شێوەیەك و فێڵێك بێت هۆکارێك ببینێتەوە تا خۆی پێ لە سەربازی ڕزگار بکات، بۆیە دەبووایە پێش ئەوەی ئێران بۆ گرتنەوەی

قەسری شیرین هێرش بکات، ئەو خۆی لە سەربازی ڕزگار کردبێت، بە تایبەتی فەوجی ئەوانیان برد بۆ سەنگەری پێشەوەی قەسری شیرین و لە بەرانبەر سوپای ئێران بوون، بۆ پارێزگاریکردن لە مانەوەی سوپای عێراق لە قەسری شیرین دایاننان.
بۆ ڕزگاربوونیش لە سەربازیدا، ئەو دەمە ئومێد ئەوەی بە بیرداهات، کە لەگەڵ برادەرێکی خۆی ڕێککەوت تا لە کاتی تەقەکردنی دوور بە دووری ئێرانییەکاندا، کە ئاراستەی سەنگەرەکانی ئەوان دەکرا، ئەو برادەرە گوللەیەك لە دەستی ئومێد بدات تا بینێرن بۆ نەخۆشخانەی سەربازی، ئیجا لێژنەی پزیشکی بڕیاری دەستبەردانی بۆ بدات لە سەربازی.
لە کاتی تەقەکردنی سوپای ئێران بۆ سەنگەری ئەوان، برادەرەکەی پلانەکەی جێبەجێ کرد و تفەنگەکەشیان شاردەوە، دوایی سەربازەکانی ئەوێندەر وایانزانی گوللەی ئێرانی پێکاویەتی، گەیاندیانە یەکەی مەیدانی پزیشکی لیوا، لەوێش ڕەوانەی نەخۆشخانەی سەربازییان کرد، ئیدی چەند ڕۆژێك لە نەخۆشخانە مایەوە، دوایی ناردیان بۆ لێژنەی سەربازی، لێژنەکەش دوای پشکنین و ڕاپۆرت و وردبوونەوە بڕیاریاندا، کە ببێتە سەربازی بێ چەك.
گەڕایەوە فەوجەکەی خۆی، ئەوانیشی بە گوێرەی

بڕیارەکەی لیژنەی پزیشکی نووسراویان بۆ بارەگەی لیوا کرد، لە شوێنی پشتەوەی لیوا لەگەڵ بێ چەکەکان لە بەشی خۆراك دایاننا.
دوای مانگێك وردە وردە برینی دەستی چاکتر بووەوە، ئەو دەیویست بە یەکجاری لە سەربازی ڕزگاری بێت، چونکە زۆر بیری خاتوونی دەکرد، بۆ ئەویش ژیانی تەنیایی لە ماڵەوە سەخت بوو.
ئەمجارە لە چڵکاوەکەی بەردەم لیوای خواردەوە، خۆی لە هۆش برد، کە گەیاندیانە یەکەی مەیدانی پزیشکی لیوا و خەواندییان، دواتر بە نەخۆشییەکی سەختی تێگەیشتن و ناردیان بۆ نەخۆشخانەی سەربازی بەغدا، لەوێندەر دوای خەواندنی چەند شەوێك ئەو وەك نەخۆشێکی سەخت و بێ توانا خۆی پیشاندان، هەموو پشکنینەکانیان بۆ کرد، لە یەکێك لە پشکنینەکاندا داوای پشکنینی پیساییان لێکرد، ئەویش بۆ ئەوەی بە نەخۆشییەکی سەخت دەربچێت، ئەو قوتووەی پێیاندابوو لە پیسایی ئاودەستە پڕ بووەوەکەی تێکرد و بردیە تاقیگە.
لە پشکنینەکەدا چەندان نەخۆشی سەختیان تۆمارکرد، دوایی لیژنەی پزیشکی بڕیاری بەخشینی دەرکرد لە سەربازی.
نووسراویان بۆ کرد و گەڕایەوە یەکەی سەربازی

خۆی، ئەوانیش بڕیاری لێژنەیان جێبەجێ کرد و ناردیانە فەرمانگەی سەربازگری هەولێر، لەوێش تۆماریان کرد و لە دەفتەری ڕاژەکەیان نووسی.
ئەو دەمەی مۆری دەسبەردان و دەربازبوون و بەخشینی سەربازی لە دەفتەری ڕاژەی سەربازی درا، وایزانی تازە هاتووەتە سەر دنیایێ، خوا هەمموو ئەم دنیایەی بەو بەخشیوە، چونکە ئیدی لەم جلکە نەگریسەی سەربازی ڕزگاری دەبێت و هەمموو کاتێك لای خاتوون دەبێت و بە ماڵ و کتێبەکانی شاد دەبێتەوە، جارێکی دیکە بێ منەت دەگەڕێتەوە سەر شۆستەی بن دیواری دادگە و دەبێتەوە کتێبفرۆشەکەی جاران، بگرە وەك ئەوانی دیکەیش نابێت، ئەو تازە ترسی گرتن و بردنی بۆ سەربازی و شەڕ و مردنی هەمموو ساتێکی جەنگ و بۆنی باروت و فیشەك و بۆنی پۆستاڵ و ڕاکردنی بەیانیان و سکەخشکێ و ئێشکگری و (قسعە خواردنی سەربازی) دوور دەکەوێتەوە، کە کەس نەیدەزانی چ گۆشتێکە و سەموونەکەشی وەك کوچکە بەرد ڕەق بوو، بە خاکەناس لەناو مەنجەڵی گەورە بۆ سەربازانیان تێدەکرد، دەبوایە چەند کەس لەناو دەفرێکی گەورەدا پێکەوە نان بخۆن. جا لە هەمموی ناخۆشتر، بۆ ئەو ئەوە بوو، کە لەگەڵ عارەباندا قسعەی دەخوارد، چونکە ئەوان

نەیاندەزانــی بــە مــلاك شــیو بخــۆن، بەڵكــو بــە دەســت دەیانخـوارد، ئەویـش بێـزی دەبـوومـوە و تێـری نەدەخـوارد.
ئیـدی ئـەوا لـە دۆزەخــی ســەر دنیـادا ڕزگاری بـوو، گەڕایـەوە بەهەشـتی خۆشــی لەگــەڵ خاتــوون و بـوومـوە كتێبفرۆشــەكەی جـاران.
كاوەش دوای مردنــی مــەروە، بــە تەنیــا لەگــەڵ هــەردوو كــوڕ و كچەكــەی مایــەوە.
مەروانــی كــوڕی قوتابــی كۆلیــژی ئەندازیــاری بــوو، بەشــی ئەنـدازەی شـارسـتانی، سـیروانیش قوتابـی كۆلیـژی پزیشــكی بەشــی ددانســازی و ســەرابی كچیشــی پۆلــی شەشــی زانســتی بــوو.

* * *

ئەمجارە ئومێد بیری بۆ کەسێکی دیکە هەڵفڕی و سیامەندی کتێبفرۆشی بیرکەوتەوە، کە لە دووکانەکانی کتێبفرۆشی بەرانبەر قەڵا کتێبخانەیەکی هەبوو بە ناوی هیوا، ئەمەش وەرگێڕانی ناوی خۆشەویستەکەی بوو، کە ناوی ئەمەل هیلالی بوو، ئەویش خوشکی مەروە هیلالی خێزانی کاوە سەرسپی بوو، کە چیرۆکی ڤینی ئەوانیش وا دەگێڕدرێتەوە:

کەسوکاری مەروە دوو سێ هەیڤان جارێك دەهاتنە سەردانی ماڵی مەروە و کاوە، جار جارەش ئەگەر دواکەوتبان کاوە و مەروە چ خۆیان بە تەنیا و چ منداڵەکنیشیان دەبردن بۆ بەسرە، بەڵام کە مەروە نەخۆش بوو و نەخۆشییەکەشی سەخت بوو، نەیدەتوانی چیدی ئەو ڕێیە دوورودرێژە ببڕێت، بۆیە ئیتر ئەوان دەهاتنە هەولێر، ئەوانیش بەپێی بارودۆخی خۆیان جاری وا هەبوو هەر تەنیا دایك و باوکی دەهاتن، جاری واش هەبوو هەموویان دەهاتن، هەندێك جاریش یەکێکیان پێی نەدەکرا نەدەهات، خاڵەکانیشی جار جارە لەگەڵیاندا دەهاتن، بە تایبەتی سەدام سبتی دوای نەخۆشکەوتنی مەروە پتر دەهات.

یەك لەم جارانە، کە هاتنە هەولێر بۆ ماڵی کاوە و مەروە، دایك و باوکی مەروە و ئەمەلی خوشکی

بوو، ئەو جارەی، کە هاتن بە ڕێکەوت سیامەندی هاوڕێی کاوە، کە دووکانی کتێبفرۆشی هەبوو لە کۆلانی کتێبفرۆشەکانی نزیك دادگە و بەرامبەر دیواری قەلا، لەوێندەر بوو، کاوە خەزوور و خەسوو و خوشکی ژنەکەی (ئەمەل) بە سیامەند ناساند، لەم دیتنەدا نیگای سیامەند و ئەمەل کەوتە سەر یەکدی، بە جوولانەوە و چاو و نیگا ڕالێبوونی یەکدیان قبوولکرد.

ئەمەل کچێکی بالا بەرزی سوور و سپی و جوان بوو و دەموچاوی پڕ بوو، بەژن زراف، ناوقەدی باریك و قژێکی خەنەیی جوانی هەبوو، هەر لە یەکەمین نیگادا دلی سیامەندی بۆ خۆی ڕاکێشا. سیامەندیش کوڕێکی گەنجی بالابەرزی چاوشین بوو، ستایلی قژی وەك مۆدیلی نوێ لووس و جوان بوو و دەبریقایەوە. هاوین بوو تیشێرتێکی سپی و پانتۆلێکی کرێمی لەبەر بوو، ئەمەلیش تەنوورمیەکی نیمچە کورت و کراسێکی گوڵ گوڵی تەنکی لەبەر بوو، ڕەنگی ستیانەکەی لەناویدا دەبینرا، دوایی کە باس هاتە سەر نەخۆشییەکەی مەروە و دکتۆر و چارسەری، سیامەند وتی:

- من دکتۆرێك دەناسم لە موسڵە و لە جۆری نەخۆشی مەرومدا شارەزایە.

بۆ بەیانییەکەی دیداریان ڕێکخست، کاوە سەرسپی و مەروە و ئەمەلی خوشکی و سیامەند بە ئۆتۆمبێلەکەی کاوە چوونە موسڵ و بۆ ئێوارەکەی چوونە نۆرینگەکەی ئەو دکتۆرەی سیامەند دەستنیشانی کردبوو، ئەویش هەروەك دکتۆرەکانی پێش خۆی هەمان نەخۆشی دەستنیشان کرد، بەڵام دەرمانەکانی گۆڕی.

ئەو دەمەی کاوە و مەروە لای دکتۆر بوون، لە ژووری چاوەڕوانکردندا، سیامەند و ئەمەل پێکەوە مانەوە و سەرسامبوونیان بۆ یەکدی ئاشکرا کرد و لە دڵەوە هەردووکیان یەکدییان هەڵبژارد و نمرەی تەلەفۆنی ماڵی خۆیان دا بە یەکدی، کە لە چ کاتێکدا تەلەفۆن بۆ یەکدی بکەن و چۆنیش لە داهاتوودا یەکدی ببینن.

هەر کاتێك ئەمەل لەگەڵ یەکێك لە خێزانەکەی دەهاتنە ماڵی کاوە، سیامەند لە ڕێی تەلەفۆنەوە بە کاتەکە و هاتنیانی دەزانی، بۆیە لەو شەوانەدا یەك دوو جار دەچووە ماڵی کاوە و لەوێندەر لەگەڵ ئەمەل یەکدییان دەبینی، کاتێك کاوەش چ بە تەنها و چ لەگەڵ زارۆکانی، چ لەگەڵ مەروەش دەچوونە بەسرە بۆ ماڵی خەزوورانی، سیامەندی لەگەڵ خۆی دەبرد، چونکە دەیزانی ئەو حەزی لە گەشتە و بۆ هەموو

سەفەرێکی دەرەوەی هەولێر پێی خۆشە، دوایی کاوە هەستی بە نیگای چاو و جوولەی نێوان هەردووکیان کرد و زانی ئەم ماستە موویەکی تێدایە، بۆیە داوای لە سیامەند کرد، کە هیچی لێ نەشارێتەوە، دەیزانی ئەم دەردە چەند سەخت و بە سوێیە، بۆیە پێی وابوو گەیاندنی دوو دڵدار بە یەکدی دەبێت چ بەختەوەرییەکی لێ بکەوێتەوە، ئەویش ڕاست و دروست خۆشەویستی خۆی و ئەمەلی پێڕاگەیاند، بۆیە کاوە بڕیاری دا یارمەتیان بدات، ئەم بابەتەش لەگەڵ ماڵی خەزووری یەکلایی بکاتەوە.

کاوە داوای لە ماڵی خەزووری کرد، کە سیامەند و ئەمەل بۆ یەکدی بن و ڕێگەی پێبدەن کەسوکاری خۆی بێنێت بۆ داخوازی، سەرەتا دایك و باوکی کێشەیان بۆ ئەم خوازبێنییە چێ کرد و ڕەتیانکردەوە، ڤێجا پاش هەوڵی کاوە و مکوڕبوونی ئەمەل، ئەوانیش قبووڵیان کرد، دواییش مام و خاڵەکانی ڕازی بوون.

ئێوارەیەکیان باوکی سیامەند، خزمەکانی لە ماڵی خۆیدا کۆکردەوە و بەرنامەی سەفەر و داخوازییان بۆ بەسرە ڕێکخست، بەیانییەکەی کەسوکاری لە کۆستەرێکدا کۆکردەوە، لە برادەرانی نزیك کاوە سەرسپی، کە بووە هاوەڵ زاوای و ئومێد ڕەشپۆشی لەگەڵ خۆیدا برد. ئیدی ئەمەل داخوازی کرا، دوایی

مارمیان کرد و هێنایانەوە هەولێر.
لە هەولێر لە باخچەی ئوتێل هەورماندا ئاهەنگی گواستنەومیان سازکرد، چەند شەوێك لەم ئوتێلەدا شەوی هەنگوینییان بەسەربرد، پاشان هاتنە ناو ئەو خانووەی کە باوکی سیامەند لە نزیك ماڵی خۆیان لە گەڕەکی ئەندازیاران بۆیان بە کرێ گرتبوون.
سیامەند پەیمانگەی کارگێڕی لە هەولێر تەواو کردبوو، ئەو کاتەی ئەو تەواوی کرد دامەزراندن هەبوو لە فەرمانگەکان، داواکاری پێشکەش ئەمینداریێتی ڕۆشنبیری و لاوان کردبوو، دوایی لەگەڵ لیستێکدا لەم ئەمینداریێتییە ومرگیرا و رموانەی کتێبخانەی گشتی هەولێریان کرد، لەوێ لە بەشی گۆڤار و ڕۆژنامەکان دایاننا و بەیانییان دموامی دەکرد، ئێوارانیش دەچووە دووکانی کتێبفرۆشییەکەی نزیك دادگە و بەرامبەر قەڵای هەولێر.
ئەمەلیش لە کۆلیژی ئادابی بەشی زمانی عارەبی لە زانکۆی بەسرە دەرچوو بوو، بەڵام هێشتا دانەمەزرابوو، سیامەند نەشیدەویست دایمەزرێنێت، بۆ ئەوەی ماڵەکەی ئاوەدان بێت.
دواتر کتێبخانەکەی سیامەند، بوو بە جێگە و ڕێگە و پاڵپشتێکی چاك بۆ کاوە سەرسپی و ئومێد.
ئومێد چی دی نەیتوانی لە هەریر بمێنێتەوە، زۆر هەوڵی

دا، ئەوەبوو بە هۆی مووسای ئامۆزای کاوە گوێزرایەوە بۆ کارگەی جگەرەی هەولێر.

ئیدی دوای تەواوبوونی کاری لە فەرمانگەکەیدا، بە پایسکل دەهاتە بازاڕ و کتێبەکانی لە کتێبخانەی سیامەند دەردێنا و تا مەغریب لەبن دیواری دادگە کتێبفرۆشی دەکرد، ئێوارانیش سەموون و پێویستی ماڵەوەی دەکڕی و یاغر یاغر بەرەو ماڵەوە شۆڕدەبووەوە. ئومێد هەر بۆ نان خواردن و چای خواردنەوە لەگەڵ خاتوون دادەنیشت و هەند: گوتووێژیان دەکرد، ڤێجا دەچووە ژووری کتێبخانەکەی و چەند کاتژمێرێک کتێبی دەخوێندەوە، گاوێکیش بەدەم داڵغەلێدان و بیرکردنەوە، شیعری دەنووسی، خاتوونیش بەدیار تەلەڤیزیۆنەوە کاتەکانی خۆی بەسەر دەبرد، تا کاتی نووستن جێگەیەک پێکەوەی کۆدەکردنەوە.

(٤)

ئومێد ئەمجارە دلاوەری بیرهاتەوە، هەموو یادگاری و بیرەوەرییەکانی لەگەڵ ئەودا، هەموو تۆمارەکانی ناو مێشکی بە پێش چاویدا لە چەندان چرکەی بلەز چڕدەبوونەوە.

ئاخر دلاوەر بۆ ئومێد وەك کەسێکی ناو خێزانەکەی بوو، ئەو تەنها هەر هاوڕێ و هاوپیشەی نەبوو، بگرە لە هەمان کاتیشدا ئەو بۆ دلاوەر جێی متمانە و سەرپەرشتیار و لە شوێنی باوکیشی بوو، چونکە ئەوەی بەسەر دلاوەردا هاتبوو، ئەگەر ئومێد و خاتوون نەبوونایە ئەویش بەرگەی مانەوەی ژیانی نەدەگرت.

ئومێد لەو دەمەیدا، ئەوەی بە بیرهاتەوە پێکەنینی بەبێ نرخی ژیان هات، ئاخر ئەم بەراوردەی دەهێنایە پێش چاوی خۆی، کە خاتوون بۆ چەندان ساڵ دلاوەری لە ماڵی خۆیدا حەواندەوە، وەك زارۆکێك، یاخۆ وەك

کۆرپەیەکی خۆی دەستی بە سەریدا دەهێنا و بەردەوام دڵی دەدایەوە، ئەو ڕووداوە ناخۆشەی لەبیر دەبردەوە، کە بەسەریدا هات و نەیتوانی جارێکی دیکە بچێتەوە ناو ژیانی خزم و کەسوکاری خۆی، یان بچێتەوەماڵی مامی.

ئەوجا ئومێد کە ئەم ڕابردووەی دلاوەری بیرهاتەوە، پێی سەیر بوو، بەراوردی لە نێوان دوو مرۆڤدا دەکرد، یاخود دوو هاوسەر و خۆشەویستی لە یەکدی جیاواز، یەکێکیان ئەو خاتوونە بوو، کە ئەو زووناسی و خۆشیویست و ئەویش ئومێدی خۆشویست و یەکدییان هەڵبژارد، ئافرەتێکی بەزەیی و بە سۆز و میهرەبان بوو، لەگەڵ ئەو خاتوونەی، کە تا ئەم چرکەساتەش ئومێد بڕوای بەوە نەدەکرد، کە بەجێی بهێڵێت و دەستبەرداری بێت، خۆشەویستییەکەی توور تێهەڵبدات و کەسێکی دیکەی خۆش بوێت و بچێتە باوەشی، ئاخر لە بیرکردنەوەی ئەودا ئەو خاتوونە لە خەیاڵدانیدا لە وێنەی خێرخوازی و خۆشەویستی و تاوێکیش لە وێنەی شەڕانگێزی و مرۆڤێکی بەدکار و بەرژەوەندخواز، یان لە نێوان دوو دیمەنی دوو مرۆڤی جیاواز دەهاتە پێش چاوی، یەکێکیان وەك فریشتە، ئەوی دیکەیشی وەك شەیتان.

ئێستەش پێی سەیر بوو، ئەو دەمەی ئومێد ڕووداوی

کوشتنی باوکی دلاوەری بۆ خاتوون گێڕایەوە، حەزی کرد وردەکاری ئەوە بزانێت، کە ئەو مامەی لە چ دۆخێکی دەروونی سەخت و تژی لە ڕك و شەڕانگێزیدا بووە، دەنا چۆن دەستی دەچێتە خوێنی براکەی خۆی و ئەو تاقە کوڕەشی کە هەیبووە، ئەویش دلاوەرە، بە تەنها و بێ باوك بکاتە هەتیوێکی باڵ شکاو و بێچارە و نەزانێت چارەنووس و داهاتووی چی لێدێت، داخۆ ڕوو لە کوێ بکات، تەنها خۆی و باوکی لە ماڵێکدا پێکەوە دەژیان، باوکیشی دوای مردنی دایکی دلاوەر، کەسێکی دیکەی نەخستە ناو ژیانی خۆی.

دلاوەر نەیدەتوانی بچێتە ماڵی مامەکانی، هەر دوای ئەم ڕووداوەش هەردوو مامەکەی دیکەی و سێ پوورەکەشی لە پێش چاوکەوتن، هیچ یەکێکیانی لەوان نەکردە مام و پلك و کەسوکاری خۆی.

ئومێد لەو لێقەومانەی ئەودا، بوو بە هاوڕێی دڵسۆز و باوك و برا و هەموو کەسی دلاوەر، ئاخر ئەو لە ڕێی کتێبفرشتنەوە دلاوەری ناسی، ئەویش زیاتر لەبەر ئەوە بوو، ئەو لە کتێبفرۆشەکانی دیکە پتر هاموشۆ و سەوداکاریی دەگەڵ ئومێددا دەکرد و کتێبی لێدەکڕی و بۆی دەفرۆشت.

جارجاریش ئەگەر ئومێد لە هەولێر نەبووایە، یان

کارێکی هەبووایە، ئیتر دلاوەر لە شوێنی ئەو کتێبەکانی بۆ ئومێد دەفرۆشت، وەکی دیش کتێبی نهێنی و دانسقەی لە ئومێد دەکڕی، بەتایبەتی کتێبەکانی مارکس و لینین و ئەنگلس و نووسەرە چەپەکان و چاپەمەنییەکانی شاخ و حیزبی شیوعی، کە لە شاخ دەردەچوون، تەنانەت چاپکراوی حیزبێلی بەرهەڵستکاری عێراقیش.

یەکێك لەو کەسانەی، کە ئومێد متمانەی تەواوی پێدەکرد، جگە لە کاوە و سیامەند ئەوە تەنیا دلاوەر بوو، قوتابی کۆلێژی ئادابی بەشی کۆمەڵناسی بوو، زۆریش حەزی لە سینەما و شێوەکاری دەکرد، ڕۆشنبیریەکەی لە عارەبیزانییەکەیدا بوو، کە هەر لەو کاتەی کە قوتابی ئامادەیی بوو، ئەو بە زمانی عارەبان کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی دەخوێندەوە، بیروباوەڕێکی چەپڕۆانەشی هەبوو، وەلێ سەر بە هیچ ڕێکخستنێك نەبوو، نووسینی ئەدەبی و ڕەخنەی شانۆیی و شێوەکاری و سینەمایی لە گۆڤارە عارەبییەکاندا دەهاتە وەشاندن، بە تایبەتی لە گۆڤاری (الثقافة)ی (د. سەلاح خالیس) کە دوای مردنی (د. سوعاد)ی خێزانی گۆڤارەکەی بەڕێوەبرد، ئەو لەم گۆڤارەدا زۆرینەی هەرە زۆری نووسینەکانی بڵاودەکردەوە، ئەگەرچی گۆڤارەکە پاداشتیشی

نەبوو، هەرچەندە ئەو بۆ پارە نەیدەنووسی، پێی وابوو نووسەر پێش ئەوەی نووسەر بێت، هەم دەبێت بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی بێت، هەمیش دەبێت هەڵوێستی هەبێت، پێی وابوو مەرج نییە نووسەر بە حیزبێکی سیاسییەوە گرێدرا بێت، بگرە دەبێت بە بیروباوەڕێکەوە پابەند بێت، تەنانەت مردنی سووریش پاشگەزی ناکەنەوە، مرۆڤی راستەقینە واتە هەڵوێست.

هەر بۆیە ئەم کوڕە هەم لە دڵی ئومێد، هەمیش لە دڵی خاتوونی هاوسەری، هەمیش لای نووسەر و هونەرمەندانی بواری شانۆ و سینەما و شێوەکاریدا شوێنی خۆی کردبووەوە، هەموو هاوڕێکانی پێی سەرسام بوون، ئەمەش هەم لەبەر زیرەکی و لێهاتوویی و توانی نووسینی، هەمیش وەك ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتنخواز و خوێندەوارێکی بە هەڵوێست.

دلاوەر هەموو ڕۆژێك سەرێکی بە چایخانەی مەچکۆدا دەکرد، ماوەیەك لەگەڵ برادەرانی دادەنیشت گوتوێژیان گەرم دەکرد، لە هەمان کاتیشدا کتێبەکانی لە جانتاکەی دەردەهێنا و پیشانی دەدان، ئەگەر برادەرێکیشیان داوای کتێبێکی لێبکردایە، ئەوا دەیزانی ئەم کتێبە لای کامە کتێبفرۆش هەیە و دەچوو لێی دەکڕی و

بەیانی دەیهێنا و قازانجێکی کەمی دەهاوێشتە سەر و دەیدایە ئەو کەسەی داوای کتێبەکەی کردبوو.
بەم ئاوایە توانی هەم خوێندنی خۆی درێژە پێبدات، هەمیش کتێبفرۆشی خۆی بکات، جارجارەش وەك هاوکارییەك بۆ ماڵی ئومێد و خاتوون شتی بۆیان دەکڕی، چونکە ئەوان پارەیان لێی وەرنەدەگرت، هەر لە خانووەکەی خۆیاندا ژوورێکیان پێی دابوو، وردە وردە خۆی ڕێکدەخست و کەرستەی پێویستی بۆ ژوورەکە دەکڕی. ئەو حەزی بە کۆکردنەوەی کتێب نەدەکرد، بگرە ئەوە کتێبەی دەیخوێندەوەش، دواتر دەیفرۆشت.
دلاوەر ڕۆشنبیرییەکی فرەوانی هەبوو، جارجارە هاوڕێکانی باسی ڕۆمانێکیان دەکرد، ئەو ڕۆمانەکەی خوێندبووەوە و بۆی باس دەکردن، بۆیە زۆر لە لێتۆژانیش بە تایبەتی قوتابیانی ماستەر و دکتۆرا لە بواری ئەدەبی و هونەریدا پشتیان پێی دەبەست و سەرچاوەی بۆ دابین دەکردن و زانیاری لەبارەی ئەو بابەتانەوە پێدەدان، کە ئەوان لە بارەیانەوە دەیاننووسی.
ئەوەی زیاتریش دلاوەر و ئومێدی لیکدی نزیك کردبووەوە، ئەوە بوو، کە ئومێد شاعیر و خوێندەوارێکی باش بوو، دلاوەریش ڕەخنەگرێکی

ئەدەبی لێوانلێو لە زانیاریی بوو.
هەردووکیان وەك دوو هاوڕێی نووسەر و وەك دوو هاوپیشە پەرەیان بە بەهرە و فرەوانبوونی ڕۆشنبیریی خۆیان دەدا، ئەگەرچی هەردووکیان برادەری نووسەر و خوێنەواری دیکەیشیان زۆر بوون، بەڵام پێوەندیی ئەو دووانە تایبەت و جیاواز بوو، هەمووان هەستیان بە خۆشەویستی نێوان ئەو دوو هاوڕێیە دڵسۆزە کردبوو.
ئومێد و کاوە سەرسپی و دلاوەر هاوڕێ بوون، چونکە هەرسێکیان هاوپیشە بوون، جار جارە ئومێد و کاوە، جاری واش هەبوو ئومێد و دلاوەر، جاری واش هەبوو هەرسێکیان پێکەوە بە دووی کتێب کڕیندا سەفەری کەرکووك و مووسڵ و دهۆك و سلێمانی و بەغدایان دەکرد، جاروباریش پێکەوە کتێبخانەیەکی تایبەتی ماڵانیان دەکڕی، کە خاوەنەکەی وازی لە کتێب خوێندنەوە دەهێنا، یان بارگەی خۆی و خێزانەکەی بۆ هەندەران دەپێچایەوە.
ئەوانە ئەگەر بیانزانیبا کتێبی باش و دەگمەن لە شارەکانی خوارووی عێراقیشدا هەیە دەچوون دەیانکڕی و دەیانهێنایەوە و دەیانگەیاندە بن دیواری

دادگـه.

ئەگـەر نووسـەرێك لەبـەر بـێ پارەیـی، یـان بـێ بژێـوی کتێبخانەکـەی خـۆی بفرۆشـتایە، ئـەوا نرخـی کەمیـان بـە کتێبـەکان دەدا، کـە کابـرا دەچـوو لـەوەی دیکەیانـی دەپرسـی کەمتـری پێـی دەگـوت، ئـەوەی دیکەیشـیان لـەو کەمتـر، تـا نووسـەرەکە بـە ناچـاری دەیـدا هـی یەکەمیـان و لـە بنـەوەش دەبوونـە هابـەش و لەنێـو خۆیانـدا کتێبەکانیـان دابـەش دەکـرد، یاخـۆ یەکراسـت دەیانفرۆشـت و قازانجەکەیـان بـەش دەکـرد.

وایلێهاتبـوو ئـەو سـێیانە تایبەتمەندبـوون، ناسـراو بـوون بـە کڕیـاری کتێبخانـە تایبەتییەکانـی مـاڵان.

* * *

دلاوەر کە باوکی بەدەستی مامی کوژرا، بۆ ماوەی مانگێك پتر تووشی هێدمە بوو، حەپەسا بوو، ترسێك نیشتبووە ناو دڵی، شەوان لەناکاو لەناو خەونی ترسناکدا ئارەقەی دەکرد، هەموو گیانی دەلەرزی، جارجارەش رادەجڵەکی، دوای ئەم ڕووداوە دەستی خوێندن و خوێندنەوە و نووسین و کتێبفرۆشتنی نەگرت، ئەو دەیزانی کە مامی لەبەر میرات لە باوکی ئەو پرە و خوشك و براکانیشی هێندەی دیکە لەبن گوێی ئەو مامەیان دەخوێند، کە ناوی زەینەڵ بوو، ئەویش هێندە دڵی پڕ بووبوو تا خۆی پێ نەگیرا و هێرشی ماڵیانی کرد و زۆرابی برای خۆی لەپێش چاوی دلاوەر دایە بەر گوللە و لە پەلەپەلییدا دەمانچەکەی لێ بەردەبێتەوە و ڕادەکات، دواییش جێی پەنجەی لەسەر دەمانچەکە و شایەدی دلاوەر و دانپێنانی خۆشی، تاوانی کوشتنەکە دەسەلمێ، دواییش بە واسیدەی براکانی لە سێدارە ڕزگاری دەکەن و حوکمی زیندانی هەتا هەتایی بەسەردا دەچەسپێ.

ئومێد دەیەویست نهێنی ئەم کوشتنە لە زاری دلاوەرەوە بزانێت، ئاخر ئەو پێی وابوو مرۆڤ هەر تەنیا لەبەر کەمی، یان بێبەشی لە میرات براکەی خۆی ناکوژێت، بەڵام دوایی لە زاری دلاوەرەوە زانی، کە زۆرابی باوکی بە ئارەزووی خۆی، یان لە کاتی بێئاگاییدا

بەڵگەنامەیەکـی بـە باوکـی پەنجەمـۆر کـردووە، کـە تێیـدا هەمـوو خانـوو و زەوی و دووکانەکانـی داوەتـە باوکـی دلاوەر، ئەویـش هەمـووی بـە نـاوی خـۆی تاپـۆ کـردووە، تـازەش دادنـادات، ئیـدی دوای مردنـی حاجـی داودی بابییـان ئـەم نهێنییـە ئاشـکرا بـووە، لـەو ڕۆژەوە هەموو خوشك و براکانی زۆراب بوون بە دوژمنی و ڕووی خۆیـان لێـی وەرگێـڕا و لـە لیسـتی برایەتیـدا سـڕیانەوە، هەرچـی ڕك و تۆڵـە و هەڕەشـە و پەسـنی خراپیـش هەیـە، خستیانە نـاو دڵـی زەینـەڵ تـا کاسـەی کینـەی تـژی بـوو، ئیـدی باوکـی دلاوەری خسـتە نـاو گـۆڕ و خۆشـی خسـتە زینـدانـەوە.

* * *

دوای تەواوبوونی ئەم دیمەنانە لە یادەوەری ئومێددا، ئەمجارە ئەو ڕۆژانەی بیرهاتەوە کە لەگەڵ دلاوەر پێکەوە دەچوون بۆ ژاراوە و بەستەستێن، لێرەوە کتێبی هەرزان و بێ سوودیان لەگەڵ خۆیان دەبرد، لەوێش لە ماڵی سەید عومەر، کە لە ماڵەوە کاری کتێبفرۆشی دەکرد، ئەویش کتێبەکانی سەیدیانی مەهابادی بۆ دەهات، کە کتێبە قەدەخەکراوەکانی کوردستانی خۆمانی لە چاپ دەدایەوە، ئەوانیش لە سەید عومەریان دەکڕی و دەیانبردن بۆ هەولێر، وەلێ ئەم کتێبانە هەروا وەك خۆی نەدەچوونە هەولێر، بەڵکو لەگەڵ چاپەمەنییەکانی پێشمەرگەدا لە شاخ، کە بریتی بوون لە ڕۆمان و کتێبی ئەدەبی و کتێبی مێژوویی و سیاسی و بڵاوکراوەکانی حیزبە کوردستانییەکان و حیزبی شیوعی عێراق و گۆڤارەکانی شاخ کە دژی ڕژێمی سەدام لە ڕاگەیاندنی ئەم حیزبانە بڵاویان دەکردەوە.

ئەوان لە هەولێرەوە ئەم کتێبە نەفرۆشراو و هەرزانانەیان لەگەڵ خۆیاندا دەبردە ماڵی سەید عومەر و لەوێ شەوێك دەمانەوە، تا بەرگی ئەم کتێبانەی شاریان لێدەکردەوە و دەیانکرد بە بەرگی کتێبە قەدەخەکان، بە کەتیرە و چرێش وایان دەچەسپاند، ئەگەر لە خاڵەکانی پشکنین و بازگەکانیشدا

سەیریش بکرابووان نەیاندەزانی، کە ئەمە کاری داهێنانی ئومێد و دلاوەرە و هەستیشی پێ نەدەکرا.

ئەوان بۆ هەرزانی کتێبەکان هەموو کتێبخانە لاپەڕگە و کوشکە دوورەکان و کتێبی هەرزانفرۆشی مالآنیان دەکردە سەرچاوە، بە زۆریش دانەی زۆریان لە کتێبە چاپکراوەکانی شێخەڵڵا شێخ وەسانی دەکڕی، کە وەك دەزگەیەکی چاپەمەنی کتێبی نووسەرانی چاپ دەکرد، دواییش لە کوشکەکەی خۆی لەگەڵ ئەحمەد ڕەنجەڕۆی شاعیر بە هاوبەشی کتێبی دیکەیشیان دەفرۆشت.

ئەو کاتە کوشکەکەیان لە گۆڕەپانی ریمەکانی هێلّی باداوە و دەوروبەری بوو، ناویشیان لەم کوشکە و کتێبخانە نابوو (دڵدار) و کەوتبووە پشت خانەی مامۆستایانی سەرەتایی ئەوسا.

شێخەڵڵا ئەم کتێبانەی بە هەرچەند بفرۆشتایە، تەنانەت بە نیوە نرخیش ئەوا هەر قازانجی بوو، چونکە ئەو قازانجی لە کاخەز و کارتۆنی بەرگی کتێب و پلێت و بۆیاخی چاپ و ئیستەرلۆن و هەموو کەرەستەکانی چاپ دەکرد، چونکە کە دەستنووسی کتێببەکەی لە نووسەرەکە وەردەگرت، دەبووایە دەستنووسەکە مۆڵەتی سانسۆری پێوە بووایە، کە مۆرێك بوو لێی نووسرابوو (یسمح) لە هەموو لاپەڕەکانی درابێت،

دەنا چاپخانەکان چاپیان نەدەکرد، ئیتر ئەو کە دەستووسەکەی وەردەگرت و دەیبردە چاپخانەی (الحوادث) یان چاپخانەی (الزمان)، کە ئەو هامۆشۆ و سەوداکاریی پتر لەگەڵ ئەو دوو چاپخانەیە بوو، لە بەغدا کە لە شەقامی ڕەشید بوون، پتریش دەچووە چاپخانەی (الحوادث)، کە دەکەوتە بەرانبەر مزگەوتی حەیدەرخانە و پشت چایخانەی پەرلەمان، کە شاعیر و نووسەرانی کورد لەوێ ڕۆدەنیشتن.

ئەو کاتە چاپخانە لاینۆ تایپ بوو، بە ئامێر پیتەکانیان لە قاڵب دادەنا، دوایی لەسەر کاخەز بۆ شێخەڵڵایان ڕادەکێشا، هەر جارەی مەلزەمەیەکی بە قەڵەمی سوور هەڵەچن دەکرد، کە هەر لە ئوتێل ئەربیل بە یەك شەو تەواوی دەکرد، بەیانی دەیبردە چاپخانە و ئەوانیش هەڵەکانیان چاك دەکردەوە، تا مەلزەمە، مەلزەمە کتێبەکە تەواو دەبوو، دوایی پێش چاپکردنی کتێبەکە دوو دانە مەلزەمەی یەکەمی کتێبەکەیان بۆ چاپ دەکرد دەچوو دانەیەکی دەبردە کتێبخانەی نیشتمانی و ژمارەی سپاردنی بۆ کتێبەکە وەردەگرت، دانەکەی دیکەیشی دەبردە دەزگەی فرۆشتنی کەلوپەلە وردەکان، کە سەر بە وەزارەتی بازرگانی عێراق بوو، لەوێ داواکارییەکی پێشکێش دەکردن، کە لە چاپخانە بۆی دەنووسرا

بۆ چاپکردنی هەزار دانە کتێب بە گوێرەی قەبارەی کتێبەکە و خەملاندنی چەندی بابەتی پێویستی چاپ، کە چاپخانە بۆی دەخەملاند و بە نووسراوی فەرمی بۆ دەزگەی فرۆشتنی کەلوپەلە وردەکانی دەنووسی، ئەویش دەبووایە ناسنامەی نووسەرەکەی پێ بێت و بە ناوی ئەو داواکاری بنووسێت و وێنەی کۆپی ناسنامەکەشی بە داواکارییەکەدا بلکێنێت، ئەویش داوای جۆری نایابی کاخەزی سپی هەشتا گرامی ئەندەنووسی دەکرد، بۆ بەرگیش داوای کارتۆنی ئارتی بریقەداری دەکرد، کە لە بازاڕدا پارەی زیاتریان دەکرد، لەگەڵ ژمارەی پلێت و ئیستەرلۆن و بۆیاخی پێویست، کە نۆرەی بۆ دەگرت و وەریدەگرت، بەڵام ئەو هەر بەوەندە نەدەوەستا، بگرە قازانجی لەوەدابوو، کە کاخەزە باشەکە و بەرگی بریقەدارەکە پارەی باشیان دەکرد، دەچوو لە چاپخانەکانی ئۆفسێت، بەتایبەتیش دەیفرۆشتە چاپخانەی ئۆفسێتی ئەلحوسام کە لە شەقامی ئەلموتەنەبی بوو.

ئەو کەرەستانەی چاپ لە بازاڕی ڕەشی کتێبخانەکاندا پارەی باشیان دەکرد، چونکە خۆیان چاپخانەکان ئەو بەشە پێویستەی لە دەزگەی کەلوپەلە وردەکان بۆ کاری چاپخانە وەریاندەگرت بەشی چاپکردنی هەموو کتێبەکانی نەدەکردن، بۆیە لە بازاڕی ڕەشدا

دەیانکڕییەوەو لە بازاڕی ڕەشیشدا نرخیان لە هی حکوومەت گرانتر بوو، دوای ئەوەی کەرستەکانی دەفرۆشتەوە هەر لە چاپخانەی (الحوداث) و (الزمان) دا بە کاخەزی زەردی ڕۆژنامە، کە ڕۆڵ بوو، مقەبای هەرزانیش بۆ بەرگی کتێبەکانی بە تیراژی (٥٠٠) دانە چاپ دەکرد، لەمەشدا دیسان پارەی کاخەزەکەی بۆ دەمایەوە، چونکە ئەو بەشی هەزار دانە پێویستی وەردەگرت، کەچی بایی (٥٠٠) دانە کتێبی چاپ دەکرد. ئەو (٥٠٠) دانەش لە هەر کتێبێکدا کە چاپی دەکرد نەیدەتوانی لە بازاڕی ساردی کتێبخانە و کتێبفرۆشەکاندا هەرمێنیان بۆ پەیدا بکات، بۆیە بە هەر نرخێك بووایە دەیفرۆشت، ئەو قازانجی خۆی لە کاخەز و کەرستەکانی چاپ دەکرد و باکی بە کوالیێتی کتێبەکان نەبوو.

شێخەڵڵا لەم کارەدا زۆر زیرەك و مەعلان بوو، لەگەڵ هەموو کارمەندانی دەزگەی فرۆشتنی کەلوپەلی ورد ڕێککەوتبوو، هەموو سەفەرێك دیاری بۆ دەبردن، بە تایبەتی ئەوان بەردەوام داوای ماستی هەولێر و کوتاڵی ئەنگۆرەی ئێرانی و گوێز و هەنگوینی چیای کوردستانیان لێی دەکرد. ماستی هەولێر لای ئەوان داواکاری لەسەر بوو، بەڵام شێخەڵڵا ئەو بارگرانییەی نەدەدایە بەر خۆی و لەمەدا

فیلێکی ئاسانی دۆزیبووەوە، ئەوانیش سوپاسگوزاری بوون، ئەو چوار پێنج مەنجەڵی ڤالا و پەڕۆك و بەنی لە ژوورەکەی خۆی لە میوانخانەی (ئەربیل) دانابوو، دەچوو لە بازاڕدا ماستی سەتڵی (کانوون)ی دەکڕی، کە کۆمپانیای شیرەمەنی بەرهەمی دەهێنا و دابەشی بازاڕی دەکرد، نرخەکەشی هەرزان بوو، ئەو چەند سەتڵێکی ئەو ماستەی دەکڕی و لە میوانخانە دەیخستنە ناو مەنجەڵی فافۆن کە ئامادەی کردبوو، دوایی بە پارچە خامێکی سپی دایدەپۆشی و بە بەن گرێی دەدا، وەك ئەوەی لە هەولێر هێنابێتی، دوایی شەو تا بەیانی مەنجەڵەکانی دەمونخوون دەکردن، تا بەیانی ئاویان لێ دەچۆڕایەوە و وەك ماستی هەولێری پەیت دەبوون، ئەوانیش کە ماستەکەیان دەخوارد بە خواردنی ماستی مەڕی هەولێر دڵخۆش دەبوون، کارەکانیان بۆ ڕادەپەڕاند و نۆرەی وەرگرتنی کەرەستەکانی چاپیان بۆ دێنایە پێشێ، جاری واش هەبوو زیاتریان بۆ دەنووسی و ئەو کەرەستە و کاخەزەیش کە نەیاندەدا بە چاپخانەکان بەویان دەدا.

ئومێد و دلاوەر و کاوە ئەم کارەی شێخەڵلایان بە قازانجی خۆیان دەزانی، بەڵام ئەو کتێبی زۆر چاپ دەکرد، ئەوانیش نەیاندەتوانی هەموو کتێبەکان

بکرێن، ئەگەرچی بە چارەکە نرخی خۆشی دەیانتوانی لێی بکرێن.
شێخەڵڵا لەم کتێبانەدا کە (٥٠٠) دانەی لێیان چاپ دەکرد، تەنیا پەنجا دانەی دەدایە خاوەن کتێبەکە، بۆیە کتێبی زۆر بوون و هەرزانفرۆشی دەکرد، ئومێد و کاوە و دلاوەریش لە هەر کتێبێکدا تا بیست، یان بیست و پێنج دانەیان بۆ کاری تێدا پێچانەوەی کتێبی نهێنی دەکڕی، ئەوەشیان بۆ ئەوە بوو تا بەرگی کتێبە تێدا ئاخنراوەکان جۆراوجۆر بن و دەزگەی ئەمن هەستی پێنەکات.
ڕۆژێکیان ئومێد بە دوای ڕۆمانی (نۆرە)دا دەگەڕا کە هی عەبدوڵڵا مەلا شینەی ڕۆماننووس بوو، چونکە قوتابییەك بۆ باسی دەرچوون هاتە لای و داوای لێکرد و لە کتێبخانەکاندا دەستی نەکەوتبوو.
ئەو ڕۆژە بە ڕێکەوت لەگەڵ دلاوەر چووبوونە لای کوشکەکەی شێخەڵڵا شێخ وەسانی و داوای ئەم ڕۆمانەیان لێکرد، بەڵام ئەو پێکەنی و ئاماژەی بە عەرەبانەیەك کرد، کە پێش ئەوان کارگەی کرێمستی عەدنان لێیان کڕیبوو تا کاخەزەکانی کتێبەکە کەرت بکەن و بیکەن بە بەرگی کرێمستی.
ئە وکاتە دلاوەریش پێکەنینی بەم جۆرە بازاڕەی

کتێب دەهات، چونکە لە چایخانەی مەچکۆ، کە نووسەرەکان لەوێ دادەنیشتن و داوایان لە عەبدوڵڵا مەلا شینە کردبوو، تا ڕۆمانەکەی لێبکڕن، ئەویش لە چایخانەدا لە پێش نووسەران و لەسەر زاری شێخەڵڵا شێخ وەسانی پێی وتبوون: (ڕۆمانی نۆرە لە بازاڕدا نەماوە، هەموویان بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان بردووە!)

ئەو وەک نووسەرێک هەر بەم خەیاڵە و بە قسەی شێخەڵڵا بڕوای کردبوو، کەچی ئومێد بە سەت تکاو پاڕانەوە دانەیەکی بۆ کڕیارە قوتابییەکەی لە عەدنانی خاوەن کارگەی کرێمستی وەرگرتبوو.

* * *

لەو دەمەدا ئومێد هێشتە لە سەربان بوو، یادەوەرییەکان لێی نەدەگەڕان خۆی فرێ بدات، کە ئەو دیمەنە سەیرەی بیرهاتەوە، لەگەڵ بێزاری و دڵپەستی خۆشی، کە دڵی لە کونی دەرزی زۆر تەنگتر بوو، لەگەڵ ئەمەش پێکەنینی بەم دیمەنە کۆمیدییە و عەنتیکەی بەم جۆرە بازاڕە سەیرەی کتێب هات، کە ئەوان بە چ جۆر و شێوازێك و چ جۆرە فێڵێك و ڕێگەیەك بۆ مەبەستی قازانجی خۆیان و قەدەخەشکێنی و شاردنەوە لە دایەرەی ئەمن و گەیاندنی کتێبی قەدەخە و کتێبەکانی شۆڕش بۆ ئەو خوێنەرانەی کە خۆیان متمانەیان پێیان هەبوو، دواییش ئەو هەڵوێست و خەبات و کارە ترسناکەی ئەوان هەمووی بوو بە بڵقی سەر ئاو، چەند کەسێکی دیکە، کە وەك ئەوان کتێبفرۆش بوون، بەڵام تا پێش ڕاپەڕین قاتی دوو پارچەی ڕەفیق حیزبییەکانی بەعسیان دەپۆشی، لە ڕۆژی ڕاپەڕینیشدا وێنەی سەرکردەکانی کوردیان بەرزکردەوە، دوایی هەر ئەوانیش بوون بە بەڕێوەبەری گشتی و کەسی لە پێشی دەزگە حیزبی و حکوومییەکان.

ئومێد بیری لەوە کردەوە لە دڵی خۆیدا دەیگوت (باشە ئەوا با بڵێین ئەو کارە نهێنی و خزمەتگوزارییەی ئەوان بۆ شۆڕشی کورد کردیان و کەس پێی نەزانی، بەڵام خۆ ئەنوەری سەعید عەولا دەیزانی، کە ئەو کاتە

پێش ئەوەی قوتابخانە تەواو بکات و ببێتە پێشمەرگە، ئەویش ناوە ناوە دەهات کتێبی هەرزانی لە کتێبخانە و ئەو کوشکانەدا دەکڕی، دوایی ئەو کتێبانەی دەبردنە سەنگەسەر و ژاراوە و بەستەستێن و چاپکراوی حیزبە کوردستانییەکان و ئەدەبیاتی پێشمەرگەی لە شاخ دەخستنە ناو بەرگەکانی ئەم کتێبانەی، کە لە شار دەبردن و بە کەتیرە و چرێش لێکی دەدان بە جۆرێك هەستی پێنەکرێت، دوایی ئەم کتێبانەی دەهێنانە هەولێر و بە خۆڕایی دەیدایە کاکە جەمۆ، کە لە بن دیواری قەلاّ و بەرامبەر کتێبفرۆشەکان کوشکێکی بچووکی هەبوو، تەنیا کۆنە کتێبی تێدا دەفرۆشت، زۆریش برادەری ئەنومر بوو، چونکە هەردووکیان دوو کەسی مارکسی بوون.

ئەنومر سەر بە ڕێکخستنەکانی شاخ بوو، جەمۆش کە ناوی خۆی جەمیل بوو لە خۆشەویستیان باوکی تەنیا ئەو کوڕەی هەبووە لە نێوان شەش کچدا، بۆیە پێی وتووە جەمۆ خەڵکەکەش هەر لە زاری باوکی و کەسوکارییەوە هەر بە جەمۆ بانگیان دەکرد.

جەمۆ ئەو کتێبانەی کە لە ئەنومر وەردەگرت دەیدایە ئەو نووسەر و ڕۆشنبیر و خوێنەرە زیرەکانەی کە تەواو متمانەی پێ هەبوون، بەردەوام هاموشۆیان دەکرد و دەیزانی نهێنی پارێزن، بە تایبەتی هەردەم ئەو کتێبانەی

دانەیەکی دەدا بە ئازاد عەلی شاعیر، ئەگەرچی ئەویش لە سەرچاوەی خۆیەوە ئەم کتێبانەی هەر بە بەرگی خۆیەوە بە نهێنی لەلایەن ڕێکخستنەکانی شاخەوە و هاوڕێیانی زۆرینەی حیزبە کوردستانییەکان بۆ دەهات، بەڵام ئەو لە ماڵەوە شوێنی تایبەتی بۆ ئەم چاپکراوانە تەرخان کردبوو و هەڵیدەگرتن و نەشی دەخستنە ناو بەرگی کتێبی دیکەوە، بگرە دەیدایە چەند کەسێکی تایبەتی لە نووسەرانی هەولێر و لەوانەی ئەو خۆی زۆر متمانەی پێیان هەبوو.

ئومێد یەکێك بوو لەو کەسانەی کە متمانەی بە ئازاد عەلی هەبوو، ئەویش هەروەها، بۆیە هەردووکیان ئەم کتێبانەیان لەگەڵ یەکدی دەگۆڕییەوە، ئومێد هەڵینەدەگرتن و دەیدایە کەسانی دیکە، بەڵام ئازاد لە شوێنی نهێنی ماڵەوەدا کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانی ئەدەبیاتی پێشمەرگەی لە شاخ هەڵدەگرت و لە نایلۆنی دەپێچاو لە کەلێن و قوژبنی وەها دەیشاردنەوە کەس بیری بۆ نەدەچوو.

ئەو برادەرانە هیچیان هەڵنەدەگرت، تەنیا ئازاد بوو بە هۆی هەڵگرتن و ئەرشیفکردنی ئەدەبیاتی هەموو حیزبە کوردستانی و عێراقییەکانی شاخ و ئەم ئەرشیفەی پاراست.

* * *

ئومێد دوای ئەو ڕووداو و دیمەنانە ئەو کاتانەی هاتەوە بیر، کە لە ڕۆژێکی پشکنینی گشتیدا کە لە ساڵی ١٩٨٤ بوو، دایەرەی ئەمن بە هاوکاری مەفرەزە تایبەتییەکان بە هۆی ڕاپۆرتێکەوە، کە بۆیان هاتبوو، گوایە چەند مەفرەزەیەکی نهێنی حیزبێکی کوردی هاتوونەتە ناو شار و لەنێو ماڵەکاندا چاپخانەی نهێنییان دامەزراندووە و بڵاوکراوە و چاپەمەنی شۆڕش بڵاودەکەنەوە.

ئومێد و دلاوەریش بەپێی ڕاپۆرتەکانی چیاد، کە چاودێری کتێبفرۆشانی دەکرد، ئەوان دەیانزانی هەردووکیان کتێبی نهێنی مارکسی و کتێبەکانی شاخ دەفرۆشن، بەڵام فێڵی بەرگ تێکگرتنەکەیان لێ ئاشکرا نەبووبوو، بۆیە بەڵگەی پێویستیان نەبوو تا بیانگرن، دەشیانزانی هەموو کتێبفرۆشان چی دەکەن و چۆن دەژین، بەڵام ئەوان بێ بەڵگە کەسیان دەستگیر نەدەکرد، بگرە بەردەوام لەژێر چاودێری بوون و چیرۆکی دلاوەریشیان دەزانی و ئاگایان لێبوو، کە لە ماڵی ئومێددا دەژی و دەشیانزانی پێکەوە سەفەری هەموو شوێنێك دەکەن بۆ هێنانی کتێب. ئومێد ئەو ڕۆژەی هاتەوە پێش چاوی، کە بۆ ماڵەکەی ئەوان مەفرەزەیەکی ئەمن هاتن و هەموو کتێب و کەلێن و قوژبنی ماڵەکەیان پشکنی، بەڵام لەبەرئەوەی

هەموو کتێبە قەدەخەکانیان بەرگی کتێبی دیکەیان تێگرتبوو، بەو کتێبانەی کە نووسینی سەدام حوسێن و کتێبە وەرگێڕدراوەکانی بڵاوکراوەی بەعس بوون، کە دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا دەیدایە چەند نووسەرێکی کورد، ئەوانیش لەبری پارە و ئافەرین دەیانکردە کوردی و دەزگەکەش بە کتێب بڵاوی دەکردەوە و نرخی زۆر هەرزانی لەسەر کتێبەکان دادەنا تاکوو بفرۆشرێن، بەڵام ناوی وەرگێڕی کوردییان لەسەر کتێبەکان نەدەنووسی، بۆیە لای خەڵکیش نەدەزانرا، کە کێ وەك وەرگێڕ هاوکاری بەعسە.

ئەوان هەندێك بەرگی ئەو کتێبانەیان دەخستە شوێنی بەرگی کتێبە مارکسی و کتێبە چاپکراوەکانی پێشمەرگە لە شاخدا، بۆیە هەرچەندی گەڕان و پشکنیان لە ماڵەکەیدا، هیچیان نەدۆزییەوە، تەنیا دوو کتێب سەرنجی ئەمنێکی ڕاکێشا ئەوانیش کتێبی (سەرمایە)ی (کارل مارکس) و ڕۆمانی (خوا لە کوێیە؟)ی (ماکسیم گۆرکی) بوون، کە دەیانویست بیکەنە بەڵگە بۆ ئومێد و دلاوەر، بەڵام ئومید نەیویست هەردووکیان بگیرێن بۆیە ڕووی لە ئەمنەکان کرد و پێیانی وت:

- ئەمە ماڵی منە و هەردوو کتێبەکەش هی منە و

دلاوەر ئـاگای لێیـان نییـە.
ئـەو بـە خەیاڵیـدا نەدەهـات ڕۆمانەکـەی ماکسـیم گۆرکـی (خـوا لـە کوێیـە؟) قەدەخـە بێـت، چونکـە لـە کتێبخانەکانـی شـەقامی ئەلسـەعدون کڕیبـووی، دواییـش بابەتەکـە ڕۆمـان بـوو و هیـچ پێوەندییەکـی بـە کتێبـی نهێنییـەوە نەبـوو، لـە کتێبخانەکانـی بەغـداش بـە ئاشـکرا دانرابـوو و دەفرۆشـران.
بۆ کتێبـی (سـەرمایە)ی (مارکس)یش بـە هەمـان شێوە، لـە کتێبخانەکانـی بەغـدا بـە ئاشـکرا دەفرۆشـران، ئـەم دانەیـەش ئێـوارەی پێشـتر برادەرێکـی لـە بەغـداوە بـۆی هێنابـوو، ئـەو ڕۆژە لـە بیـری چووبـوو، یـان هێشـتاکە نەیخستبووە نـاو بەرگـی کتێبێکـی دیکـەوە، هـەر خـۆی دەیزانـی لـە بەغـدا بـە ئاشـکرا لـە کتێبخانەکانـدا دانـراوە، بۆیـە هـەم وەك بـە هەنـد هەڵنەگرتـن، هەمیـش بـە خەیاڵیـدا نەهاتبـوو بیخاتـە نـاو بەرگـی کتێبێکـی دیکـەوە.
ئـەوان هێندیـان بـەس بـوو، کـە بیسـەلمێنن ئـەو کەسـەی دەیانەوێـت بەڵگەیەکـی بەسـەردا بسـەپێنن، هـەم دژی بوونـی خوایـە، نووسەرەکەشـی نووسـەرێکی ڕووسـییە و بـۆ ئـەوان لەگـەڵ کتێبـی (سـەرمایە)ی مارکسـدا بـە لێـدان و ئازاردانـەوە شـیوعییەتی شـاعیرێکیان بـۆ دەسـەلمێنێت، کـە شـیعرەکانی نیشـتمانپەروەرین،

هەمیش هەڵگری بیروباوەڕێکە، کە لە عێراقدا هێڵی سووره و دەچێتە خانەی دوژمن و نەیارەکانی حیزب و شۆڕشی (١٧- ٣٠)ی تەمووز و وەك تێکدەر و دژی شۆڕشی ئەم وڵاتە دێتە ئەژمارکردن.

ئومێد لەو دەمانەدا یادەوەرییەکانی گەڕایەوە، بۆ ئەو ڕۆژانەی کە گرتیان و بە چاو بەستراوەیی خستیانە ناو ئۆتۆمبێلێکی دایەرەی ئەمن، دوو کتێبەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا برد، ئا لەو کاتەدا، ئەو ژوورەی هاتەوە یاد لە دایەرەی ئەمن، کە کاتی خۆی شوێنی قوتابخانەی دواناوەندی بوو، دواتر کردبوویانە دایەرەی ئەمن. بیری هاتەوە کە ئەویان بە چاوبەستراوی خستە ژوورێکی ئاودەستەکەوە، لە ژوورەوە چاویان کردەوە، کە پانی و درێژی مەتر بە مەترێك زیاتر نەبوو، بەڵام ئەوان شوێنی پیسایيان پڕ کردبووەوە. ژوورەکە تاریکستانێك بوو، چونکە نە ڕۆژی لێ دەدا، نە دنیای دەرەوەی دەبینی، تەنیا دەبووایە تەماشای بنمیچی ژوورەکە و چوار دیواری ئاودەستەکە بکات.

ئەو کاتانە بۆ ئەو مردنێك بوو، چونکە بۆ ماوەی چل ڕۆژان، ڕۆژێ جارێك بە چاو بەستراوەیی دەیانبردن بۆ لێدان و فەلاقە و کارەبا لێدان و تف و جوێن پێدان، دەیانویست دان بە ئەندامبوونی خۆی بنێت لە ڕێکخستنە نهێنییەکاندا، ئەو مادام کتێبی مارکسی

له دهست گیراوه دهبێت سهر به ڕێكخستنێكی نهێنی بێت، دهیانویست بزانن سهر به ڕێكخستنهكانی چ حیزبێكه.

ئهو لهم كاتانهدا كه به چاوبهستراوی لهم ژووره بچووكه دهریان دههێنا، بهڵام لهبهر لێدان و ئازاردان و ئازارهكانی گیانی و جهستهی، ئاواتی ئهوهی دهخواست ههر له ژوورهكهی بووایه، تهماشای دار و دیوار و بهدهم داڵغهلێدان و بیركردنهوهی ژیانی دهرهوهی زیندان، ههر به خهیاڵ ئهم ڕۆژانه بهڕێ بكات.

ئهو له كاتی لێدان و ئازارداندا هاواری دهكرد:

- وهڵڵا من تهنیا خوێندهوارێكم بۆ ڕۆشنبیری گشتیی خۆم ئهم كتێبانه دهخوێنمهوه.

ئهوانیش زیاتریان لێدهدا و دهیانوت:

- تۆ به دوای خوادا دهگهڕێی و بڕوات پێی نییه، دهنا چۆن كتێبی (خوا له كوێیه؟) دهخوێنیتهوه، كه نووسهرهكهی ڕووسییه و شیوعییه و گاوره.

ئهویش بهرسڤی دهدانهوه و دهیگوت:

- ئهی هاوار ئهو ڕۆمانه، چ پێوهندیی به بوون و نهبوونی خوا و شیوعییهتهوه ههیه، ئهم ڕۆمانه باسی ئازارهكانی مرۆڤ دهكات و بهرههمی مرۆڤایهتییه.

ئهوانیش تووڕەتر دهبوون و زیاتریان لێدهدا، بهدهم شریخهی قامچییهوه دهیانگوت:

- باشـه بـا ئـەم کتێبـە ڕۆمـان بێـت، ئـەدی کتێبەکـەی دیکـە (سـەرمایە)ی (کارل مارکس) خـۆ ئـەو کتێبـی شـیوعیانە، تـۆ ئەگـەر کۆمۆنیسـت نەبیـت چ کارێکـت بـەم کتێبەیـە.

ئەویش بە نەرمییەوە وەڵامی دەدانەوە و دەیگوت:

- باشـە، بـەڵام هەمـوو کەسـێك پێویسـتە بیخوێنێتـەوە، ئـەدی ئەگـەر پێتـان قەدەخەیـە و حەزناکـەن کـەس بیخوێنێتـەوە، بۆچـی نـەك هـەر ئـەم دوو کتێبـە، بگـرە سـەدان کتێبـی هاوشـێوەی ئـەم کتێبانـە لـە هەمـوو کتێبخانەکانـی بەغـدا بـە ئاشـکرا دەفرۆشـرێن و لـە هەمـوو کتێبخانەکانـدا دانـراون و خەڵـك دەیانکـڕن.

- ڕاستە بە ئاشـکرا دانراون، بەڵام ئێمە مەبەستی خۆمان هەیـە، کـە بۆچـی لـە کتێبخانەکانـدا قەدەخەمـان نەکـردووە، تـا بزانیـن چ کەرێکـی وەك تـۆ خـۆی لـە ئێمـە ئاشـکرا دەکات و دەیانکڕێـت.

- ئـەدی بۆچی کتێبخانـەکان ناگـرن، کـە ئەم کتێبانە دەفرۆشن.

- ئەمـە کـار و نهێنـی خۆمانـە، تـۆ هەقـت بەسـەر ئـەم کارەی ئێمـەدا نەبێـت، ئـەدی چـۆن کەسـانی وەکـو تـۆ شـیوعی بدۆزینـەوە!

- بـە خـوا مـن نـە شـیوعیم، نـە سـەر بـە هیـچ حیزبێکـی دیکەیشـم، تەنیـا کـوردم.

- ئەدی چیت، خۆت بە زاری خۆت پێمان بڵێ، بۆ خۆت باشترە، ئەگەر یارمەتیمان بدەیت حوکمەکەت کەمتر دەبێت، ئەگەر ببیتە هاوکاریشمان ئەوا یەکسەر ئازادت دەکەین، دەنا تا سەر نکۆڵی لێ بکەیت و کەللەڕەق بیت و ددانی پێدا نەنێیت، چی دیکە ژیان بە چاوی خۆت نابینیتەوە.
- نەخێر من سەر بە هیچ حیزبێك نیم، تەنیا كاری كتێبفرۆشی خۆم دەكەم و شاعیرم و شیعرەكانیشم لە گۆڤار و ڕۆژنامە كوردییەكانی بەغدا و هەولێر بڵاودەكەمەوە، دیوانە شیعریشم كە چاپم كردووە لە ڕەقابەدا مۆڵەتی چاپكردنی پێدراوە.
- دەزانین شاعیریشی و كتێبفرۆشیشی و نازناوی شیعریشت ڕەشپۆشە، ئەمەش واتای وایە تۆ بۆ كورد ڕەشپۆشی، هەروەها دەشزانین تۆ لەگەڵ بیری ماركسیزم و لینینیزمدا هاوسۆزی و لە تۆماری ئێمەدا تۆ كەسێكی كۆمۆنیستی، لە شیعریشدا هێڵی شۆڕشگێڕیت هەڵبژاردووە، لەژێر پەردەی فەلەستین و هێمای جیاوازدا دژی دەسەڵاتی ئێمەیت، ئێمەش لە هەموو شتێكی تۆمان كۆڵیوەتەوە و نوێنەرەكەمان كە چاودێری كتێبفرۆشەكانە هەموو زانیارییەكی تۆی داوە بە ئێمە، بۆیە پێمان باشە و قازانجی تۆیە لەسەر زاری خۆت ددان بە تاوانەكانی خۆتدا بنێیت و

ناوی نهێنی شانەکەتان و لێپرسراوی خۆتمان پێ بڵێیت، ئەمەش بۆ تۆ حوکمەکەت سووکتر دەکات، ئەگەر هاوکاریشمان بیت و کارمان لەگەڵدا بکەیت و زانیاریمان بدەیتێ، ئەوا بێگومان لێرە دەرتدەهێنین و دەتوانی نەشهێیت بۆ ئێرە تەنیا زانیارییەکانت بدەیتە نوێنەرمان، کە لەسەر کتێبفرۆشەکان دامانناوە، بەڵام ئاگەدار بە ئەوە دەبێت نزیکترین کەسیشت نەزانێت، ئەگەر کەسێك زانی ئێمە خۆمان لەسەر دنیا دەتسڕینەوە، ئێمەش لە بەرانبەر هاوکاری تۆ ئەم نهێنییە دەپارێزین و ناهێڵین کەس پێی بزانێت، لە بەرانبەریشدا تۆ هەرچیت دەوێت ئێمە بۆ تۆی دەستەبەر دەکەین و دەبینە پاڵپشتی تۆ. هەموو جار دوای مشتومڕێکی زۆر ئەو هەر نکۆڵی لەوە دەکرد، کە سەر بە هیچ ڕێکخستنێك بێت و بەرگەی هەموو ئەم ئازارانەی دەگرت، کە دەیبینی و هەموو جارێکیش کە لێی بێ هیوا دەبوون وەك بێ گیانێك دەیانگەڕاندەوە ژوورەکەی خۆی.
ئەو خواردنەی دەشیاندایێ نەیدەزانی لە ژوورێکی وادا و بەم بارە دەروونییە چۆن بە گیانی دەکەوێت، ئاخر بەیانیان لەبن دەرگەوە قوتوویەك ماستی بچووك، کە ئەوکاتە کارگەی شیرەمەنی دەیخستە بازاڕ و لەگەڵ سەمونێکدا بۆی فڕێدەدرایە ژوورەوە،

ئێوارانیش دەفرێکی بچووك برنج، یاخۆ نیسك لەژێر دەرگەوە بۆی ئاودیوی ژوورەوە دەکرا، دوو ڕۆژ جارێکیش هەندێك ئاویان بۆ لە قاپێکی تۆزێك قووڵ دەکرد. دە ڕۆژ جارێکیش یەکە یەکە دەریان دەهێنان و دەیانبردن بۆ گەرماومێکی بچووك و ماوەکەشی کە بۆیان دانرابوو تا خۆیان بشۆن تەنیا پێنج خولەك بوو، دەبووایە ئەو کەسە بە خێرایی خۆی بشوات و لەگەڵ فیکەی پیاوانی ئەمن بێتە دەرەوە، دوایی یەکە یەکە دەیانبردنەوە ژووری خۆیان، هەموو چوون و هێنانەوەیەکیشیان بە لێدان و غاردانێ بوو. بۆ ئاودەستیش لە بیست و چوار کاتژمێردان تەنیا جارێك بۆ پێنج چرکە بۆیان هەبوو داوای خۆ ڤالاکردن بکەن، خۆ ئەگەر جگە لەو کاتە پێویستی گەورەی هەبووایە، ئەوا دەبووایە بەخۆیدا بکات و لەکاتی دیاریکراوی جل شووشتندا جلەکانی لە پیسایی پاك بکاتەوە و جل بشوات، هەر لە ژوورەکەی خۆیدا لە لایەك دایبنێت تا وشك دەبێتەوە، ئەگەر پێویستی بچووکیشی هەبووایە دەبوو میزەکە بە دیواردا بکات، ئەمەش وایکردبوو بۆنی ئەم ژوورە بچووکانە وەك لەناو ئاودەستێکدا بژین وابوو.

ئەوانیش باکیان بەمە نەبوو، ئەو کەسە چۆن دەگوزەرێت، بگرە خۆیان ئەمەیان پێ باشتر بوو، کە

هەست بە بێزاری بکەن و زووتر ددان بە تاوانەکانیاندا بنێن و بۆ ئەوانیش ئەنجامێکی هەبێت.
بەم جۆرە بۆ ماوەی چل ڕۆژان، بەرگەی هەموو سەختییەکانی ئەوان ڕۆژانی گرت. لە دواییدا هەوڵەکەی کاوە سەرسپی هاوڕێی سەریگرت، کە ئەویش لە ڕێگەی مووسا ئەبو شوارب، کە مەفرەزەی تایبەتی هەبوو، لە دایەرەی ئەمن دەستی دەڕۆیشت، ئەمەش کاوە بەڵێنی پێدابوو، ئەگەر ئەو توانی ئومێد ڕزگار بکات ئەوە دوای بەربوونی پارەیەکی باشی لە ئومێد بۆ وەردەگرێت.
ئومێد جارێکی دیکە چاوەکانی بە دنیای دەرەوە هەڵێنایەوە، ئەو داوای هەردوو کتێبەکانی کردەوە، بەڵام نەیاندایەوە بە بیانووی ئەوەی کتێبەکان دەستیان بەسەردا گیراوە، بۆیە بە فیزێکەوە و بە تووڕەییەوە پێیان وت:
- دەبێ سوپاسگوزاری مووسا ئەبو شوارب بیت، کە ڕزگاری کردیت، دەنا نەك هەر ئەو دوو کتێبەت، بگرە خۆشت وەك هەردوو کتێبەکانت لە لای ئێمە دەمایەوە.

* * *

ئومێد کە لە زیندان هاتەدەر زۆر بیری لەوە دەکردەوە دەبێت کێ بێت ئەو کەسەی لە دائیرەی ئەمن کارمەندیانە و بۆ چاودێری کتێبفرۆشان دانراوە.
بیری بۆ ئەو کوڕە ڕەشتاڵەیە چوو، کە هەموو ڕۆژێك دەهاتە لای و کتێبی لێدەکڕی و زۆریش گوتووێژی لەگەڵدا دەکرد، بوو بووە برادەریشی، وایلێهاتبوو متمانەشی پێدەکرد، چونکە ئەو پیاوە وەك کەسێکی دژە بەعس خۆی پیشان دابوو، لە گوتووێژشیدا وەك خوێندەوارێکی بە هەڵوێست و ڕۆشنبیرێکی یاخی خۆی خستبووە ناو دڵی ئومێد. ئەو پیاوە ڕەشتاڵە خوێندەوار و ڕۆشنبیرەی زۆرینەی هەر زۆری ڕۆمانەکانی دنیا و ڕۆمانی عارەبان و وڵاتانی دەوروبەری خوێندبووەوە، نووسەرەکانی دەناسی و باسی دەکردن، تەنانەت زۆرینەی کتێبە کوردییەکانیشی خوێندبووەوە و دەیکڕین و دەیزانی نووسەرەکەی کێیە، گەلێك لە نووسەرانی کوردیشی دەناسی و دەیزانی چییان نووسیوە و چۆن بیردەکەنەوە.
لە میانی یەکدی پرسین و دەمەتەقێ و پرسیار و وەڵام و لێکۆڵینەوەی ڕەچەڵەك و هەڵدانەوەی پەڕاوی یەکدی زانی، کە ئەو پیاوە ڕەشتاڵە ڕۆشنبیرە:

- ناوی: چیاد عوگڵە خڵەیف لهێبی بوو.
- شوێنی: خەڵکی مەخموور بوو.
- ڕەگەزی: عارەب بوو، بەڵام کوردی بە نووسین و

خوێندنـەوە و قسـەکردنیش بـە باشـی دەزانـی.
ئـەوەی کـە ئومێـد لـە میانـی برادەرایەتـی ئـەودا پـەی پێنەبردبوو ئـەوە بـوو، کـە نەیدەزانـی ئـەو سـەر بـە دائیـرەی ئەمنـە و لای ئـەوان مفـەوەزە و وەك بەرپرسـی چاودێـری کتێبفرۆشـانی هەولێـر چاودێـری ئـەوان دەکات، بگـرە وایدەزانـی و وا خـۆی ناسـاندبوو، کـە جێگـری ئەفسـەرە لـە سـوپای عێراقـدا، بەڵام لـە مەخمـوور فێـری کـوردی بـووە و خۆشـی بـە زیرەکـی خـۆی فێـری خوێندنـەوە و نووسـینی کـوردی بـووە، ئەگەرچـی ئـەو خـۆی لـە چەنـد خولێکـی فێرکردنـی زمـان و خوێندنـەوە و نووسـینی کـوردی دەرچوو بـوو، کـە دائیـرەی ئەمـن بـۆ باوەڕپێکراوانـی ئەمـن دەیکـردەوە، هـەر لـەم خولانەشـدا فێـری ناسـینی ئەدەبـی دنیـا و ئەدەبـی کـوردی کرابـوو، دەبـوو زۆر بخوێنێتـەوە و پـارەی باشیشـی بـۆ دابیـن کرابـوو، تـا بـەردەوام کتێـب لـە کتێبفرۆشـان بکـڕێت و ببێتـە جێگـەی متمانـەی ئـەوان.
ئـەو دەبووایـە وەك کەسـێکی دژ بـە ڕژێـم و وەك ئۆپۆزسـیۆنێك و لایەنگیـری حیزبـە بەرهەڵسـتکارەکانی عێـراق خـۆی بناسـێنێت و سـۆزی خۆیشـی بـۆ دۆزی کـورد دەرببـڕێت و وەك کەسـێکی کەللەڕەقـی دژی سـەرۆکی فەرمانـدە لای ئومێـد و کتێبفرۆشـانی دیکـە ببینرێـت.
ئـەو پیـاوە لـە هەمـوو کتێبفرۆشـان زیاتـر شـەیدای ئومێـد بـوو، گوتووێـژی زۆری لەگەڵـدا دەکـرد، بـەردەوام کتێبـی

هزری و فەلسەفی و ڕۆمانی جیهانی لێدەکڕی، ئەگەرچی ئەو زۆرجار ڕاپۆرتی لەسەر ئومێد نووسیبوو، وەك کتێبفرۆش و شاعیرێکی بەرهەڵستکار و لایەنگری شۆڕشی کورد ناساندبووی، بەڵام دەرینەخستبوو کە لایەنگری کامە حیزبە، بەڵام گومانی لایەنگیری بیری کۆمۆنیستی لێدەکرێت، ئەو ئەوەشی نووسیبوو کە ئومێد لە هەموو لایەکەوە کتێبی بۆ دێت و خۆشی لە هەموو لایەکەوە دەچێت کتێب دەهێنێت و دەیفرۆشێت، تەنانەت ئەگەر لە خوارووی عێراقیشدا ئەم کتێبانەی ئەو دەیویست هەبیت، ئەو لاری نییە بچێت بیهێنێت و بیفرۆشێت؟

دائیرەی ئەمن بۆ تاوانبارکردنی بەڵگەی پێویستی نەبوو، ئەمجارەش کە گیرا دووەمین جار بوو، کە بگیرێت، جارێکیان لە زاڵگەی کەرکووك گیرا، چونکە کتێبی مارکسی لەژێر کتێبەکانی سەدام حوسێن دانابوو، ئەو جاری بە سەد ناڵی عەلی بەربوو، ئەمجارەشیان لەسەر دوو کتێب چل ڕۆژانیان لە دوڕ ژوورێدا پەستاندا، تەنانەت هیچ گیاندارێکیش ناتوانێت تیایدا بژیت نەك مرۆڤ، ئەمجارەش لەسەر دوو کتێبان، ئەگەر مووسا ئەبو شواربی ئامۆزای کاوە سەرسپی بەهانایەوە نەچووایە، ئەوا بێگومان پێستیان کەوڵ دەکرد.

دائیـرەی ئەمـن دەیانزانـی ئومێـد سـەری هـەواڵان و بنـی گەواڵانە، دەیانزانی بە هۆی کتێبفرۆشتن و ڕۆشـنبیرییەوە خەڵکێکـی زۆر هۆشـیار دەکاتـەوە، وەك شـاعیریش هەسـتی نیشـتیمانی بەرزیـان لـە کەسـایەتی ئـەودا دەدیـت، بەڵام ئومێـد ڕکـی لـەو پیـاوە نەبوو، کـە لای ئـەو بـە نـاوی عەبـاس ئەلسـوڵتانی خـۆی ناسـاندبوو، خـۆی وەك مرۆڤێکـی پاك و دژی ڕژێم بە ئومێد ناسـاندبوو، لە ڕاستیشـدا ئەو خۆی زۆر بـە ڕۆشـنبیرییەکەی ئومێـد کاریگـەر بـوو، چونکـە زانیاریـی زۆری لابـوو، ڕۆشـنبیرێکـی سـەرتاپاگیریش بـوو، سـەری لـە هەمـوو زانسـتێکدا دەردەچـوو، ئەویـش کاری لـە هەسـت و جـۆری بیرکردنـەوەی ئـەو کردبوو، بووبـوو بـە سـەرچاوەی خوێندنـەوە و ڕۆشـنبیری و هەمـوو دەرگەکانـی دنیـای کتێـب و سـیحری خوێندنـەوە و نهێنـی و دیالـۆگ و مەعریفـەی دنیـای لـێ فێـر دەبـوو، هـەر بـە هـۆی کتێـب و ئومێدیشـەوەیە، کـە ئـەو فێـری ئـەم خوێندنـەوە قـووڵ و سـەرتاپاگیرییە بـووە.

ئەگەرچـی ئـەو وەك ئەرکـی خـۆی دەبووایـە ڕۆڵـی ڕۆشـنبیر و خوێنـەر ببینێـت تـا بـکارێـت بخزێتـە نـاو نهێنـی ژیانـی و هەڵسـوکەوتی کتێبفرۆشـانەوە، بـەڵام لەگـەڵ ئەمەشـدا بـە هـۆی ئومێـدەوە زۆر کتێبـی دەخوێنـدەوە، کـە دائیـرەی ئەمـن پێـی خـۆش نەبـوو بـەم ڕادەیـە کتێـب بخوێنێتـەوە، خـۆ ئەگـەر بشـیانزانیبایە بێگومـان لێـی نەدەگـەڕان، بگـرە

ئاگەداریشیان دەکردەوە، ئاخر ئەوان تا ئەو ڕادەیە ڕێگەیان پێدابوو، کە بتوانێت ڕۆڵی ڕۆشنبیرێکی دژی ڕژێم لای کتێبفرۆشان بگێڕێت و ببێتە جێی متمانەی ئەوان، بەڵام لە ڕاستیشدا ئەوان نەیاندەویست ئەم تاکوو ئەو ڕادەیە خوێندەوار و ڕۆشنبیر بێت و چاوی بە ڕووی دەوروبەر و ژیاندا بکرێتەوە، لە ڕاستییەکان و هەموو نهێنییەکان بگات، چونکە دەیانزانی ئەگەر ئەو ڕادەی تێگەیشتنی پتر بێت، ئەوان کەمتر دەکارن کۆنترۆڵی بکەن، بگرە پێیانن وابوو لە دەستیش دەردەچێت.

ئەو پیاوە توانیبووی هاوسەنگی خۆی لە نێوان دایەرەی ئەمن و کتێبفرۆشاندا ڕابگرێت، ئومێد وا کاری لێکردبوو، کە ڕۆژ بە ڕۆژ سەرچاوەی بیری فرەوانتر بێت، لەگەڵ ئەمەش لەم ڕاپۆرتانەی دەینووسی، هەموو شتێکی نەدەزانی تا بینووسێت بەتایبەتی نەیدەزانی ئومێد و دلاوەر دەچنە بەستەستێن و لە هەولێر کتێبی هەرزان لەگەڵ خۆیان دەبەن و لەوێندەر بەرگەکانیان لێدەکەنەوە و دەیکەنە بەرگی کتێبەکانی شاخ، چونکە ئەم کارەی ئومێد زۆر بە نهێنی بوو تەنیا خۆی و دلاوەر و کاوە و سەید عومەری بەستەستێن کە کتێبەکانی شاخی بۆ ئامادە دەکردن، لەوان بترازێت کەسی دیکە نەیدەزانی.

تاکە کەسیش کە جگە لە ئومێد و دلاوەر و کاوە،

ئـەوا ئەنـومری سـەعیدی عـەولا بـوو، کـە بـێ ئاگـەداری ئومێـد و دلاوەر دەهاتـە بەستەسـتێن و هـەر لای سـەید عومـەر، بەرگـی کتێبەکانـی شـاری دەکـردە بەرگـی چاپەمەنییەکانـی ئەدەبیاتـی شـاخ، وەك کارێکـی نیشـتمانی خۆبەخـش دەیهێنانـە هەولێـر و بەسـەر خەڵکـی ڕۆشـنبیری هەولێـردا بـڵاوی دەکردنـەوە، ئەمـەش وەك پەیامێکـی کوردپەروەرانـە دەکـرد، وەلـێ هـی ئومێـد و دلاوەر و کاوە وەك پیشـە و بـۆ مەبەسـتی پـارە بـوو، ئەگەرچـی ئـەوان خۆیـان بـەکاری کوردپەروەریشـیان ئەژمـار دەکـرد، بـەڵام سـەید عومـەر نهێنـی هـەردوو لای پاراسـتبوو، بە هەردوولایانـی نـەدەوت، کـە لاکـەی دیکـە دێنـە بەستەسـتێن، هەردوولایـان پێیـان وابـوو تەنهـا خۆیانـن، لەگـەڵ سـەید عومـەر ئـەم کارە دەکـەن، ئەمەشـی بـۆ ئـەوە بـوو، تـا وەکـوو ئـەم کارە بـە نهێنـی بمێنێتـەوە.

ئـەو زۆر بـە کەسـایەتیی ئومێـد کاریگـەر بـوو، شـیعرەکانی دەخوێنـدەوە، بـە توانـی شـیعری و ڕۆشـنبیری ئومێـد سەرسـام بـوو، دیوانـە چاپکراوەکـەی ئومێـدی لـە پێشـەوەی کتێبخانەکـەی ماڵـەوەی دانابـوو، کـە نـاوی لێنابـوو (زامـی ئەوینێکـی کـپ کـراوە) کـە ئومێـد بـە واژۆی خـۆی پێشـکێشـی کردبـوو.

ئومێـد دەیزانـی کـە ئـەو ماڵـی لـە گەڕەکـی جێگـری ئەفسـەرانی سـەر ڕێگـەی عەنکاویـە و دەدرێتـە

جێگری ئەفسەرانی عێراق و میری ئەو خانووەی پێداوە، چونکە ئەو لای ئومێد وەك جێگری سوپای عێراق خۆی پێناساندبوو، تا ئەو دەمەی یەکدی بینینیان لەگەڵ یەکدی دانا، لە غاباتی کوران پێکەوە دانیشتن و یەکدیان بینی، دواییش بەرانبەری وێستا و دەمانچەکەی دەرهێنا و پێی وت:

- ئومێد هەرچەندە من و تۆ برادەرین، بەڵام من بۆ کوشتنی تۆ ڕاسپێردراوم.

- بۆچی دەمکوژی و لەسەر چی و کێ ڕایسپاردووی؟

- پێت ناڵێم کێ ڕایسپاردووم، بەڵام هۆیەکەی بۆ ئەوەیە، چونکە تۆ خاوەن قەڵەمی و هۆشیاریت و بە هەموو شێوەیەك بۆ حکوومەت و شۆڕش مەترسیداری!

- بۆ هەر من، ئەدی خەڵکی دی؟

- بە بۆچوونی من ئەوە، ئەو دەزگایەی، کە نایەوێت تۆ بمێنیت، چونکە تۆ خەڵك لە حیزب و شۆڕش هۆشیار دەکەیتەوە و هانیان دەدەیت و گەنجان دژی میری و شۆڕش پەروەردە دەکەیت، وەك شاعیریش لەگەڵ چەتە جوداخوازەکانی شاخدا هاوسۆزی و دژی حیزبی بەعسی.

- ئەدی بۆچی دەستگیرم ناکەن؟

- چونکە گیرانی تۆ زۆر گرینگ نییە، دووجاران گیراوی و دانت بە تاوانەکانتدا نەناوە، بۆیە بەردراویت و گەڕاویتەوە ماڵی خۆت.

- دیاره تۆش لە دایەرەی ئەمنی، ئەدی چۆن توانیت ڕۆڵی جێگری ئەفسەرێکی عێراقی دژە ڕژێم ببینیت؟
- کاری ئێمە وایە، ئەگەر بتزانیبایە، تۆش لە من نزیك نەدەبوویتەوە، ئێمە نەماندەتوانی ئەرکی خۆمان ببینین.
- کەواتە تۆ کارمەندێکی ئەمنیت و بۆ کوشتنی من ڕاسپێردراوی؟
- بەڵێ.
- جا ئێوە چ پێویستیتان بە بەڵگە و سەلماندن هەیە، ئەگەر مەبەستتان بێت کەسێك بکوژن، هۆکارێکی بۆ دەبیننەوە و بێ پرس دەیکوژن و لە ناوی دەبەن، یاخۆ شوێن بزری دەکەن، منەتتان بە هیچ نییە.
- نەخێر وا نییە، ئێمە بێ بەڵگە هیچ شتێك ناکەین، ئەگەر وابووایە نیوەی ئەو خەڵکەمان دەگرت و لە زیندانەکانمان دەپەستان.
- ئەدی ئەوە نییە وا تۆیان ناردووە، من لەناو ببەیت، کوا چ بەڵگەی تاوانباری منتان لایە، بۆچی ڕێگەی دیکە ناگرنەبەر.
- ئێمە دەتوانین هەموو شتێك بکەین، دیارە حیزب و شۆڕش لە ڕێگەی دایەرەی ئەمنەوە زانیویەتی، کە مانەوەی تۆ لە ژیان، بەرهەڵستکاری شۆڕشی ١٧- ٣٠ تەمووز زیاد دەکات و بەرەی خەڵك و شۆڕشی کورد بەهێز دەکەیت، بە گرتن و لێدانیش نەتوانراوە چارەی

تۆ بکرێت.
- بەڵام من کتێبی خۆم دەفرۆشم و کاسبی بە کتێبەوە دەکەم.
- تۆ هەر تەنیا کتێبفرۆش نیت، شاعیرێکی شۆڕشگێڕ و پێشمەرگەی نهێنی...
- نەخێر ئێوە بە هەڵە لە من تێگەیشتوون، وا نییە، ئەم شارە دەیان کتێبفرۆش، شاعیر و نووسەر و خوێندەوار و ڕۆشنبیری دیکەی تێدایە، بۆچی من مەترسیم؟
- ئاخر تۆ، یەکێکی لەو کەسانە، کە دەبێت لەسەر ڕێگەی حیزب و شۆڕشی ١٧- ٣٠ی تەمووزدا بسڕێیتەوە.
- بەڵام کوا بەڵگەتان؟
- بەڵگەمان فایلی تۆیە کە لای خۆمان بۆ تۆمان کردووەتەوە.
ئومێد بە چاوی خۆی بەم جۆرە، ئەو کابرایەی بینی و بە گوێی خۆی گوێی لە قسەکانی بوو، بڕوای نەکرد، کە ئەوەی دەیبینێت و دەیبیسێت ڕاست بن، چونکە تاوەکوو ئەو چرکەساتانەش، هەر وایدەزانی ئەو پیاوە جێگری ئەفسەری سوپای عێراقییە و عارەبی مەخموورە، ئەو وایدەزانی بە هۆی کارەکەیەوە، کەوتووەتە هەولێر، لەو گەڕەکەی هەولێر ئاکنجییە، بەڵام تاوەکوو نها کە ئەو هاتووە بیکوژێت، ئەو هەر وەك برادەرێکی کۆن و کڕیاری بەردەوامی

کتێبفرۆشییەکەی و وەك پیاوێکی ڕۆشنبیر و دژی دەسەڵات لە مێشکی ئەودا وێنای کردبوو، بەڵام ئەو نەیتوانی ئەم فەرمانەی دائیرەی ئەمن جێبەجێ بکات، بەڵکو کە دەمانچەکەی بەرانبەری ڕاگرت و پێی وت: هاتووم تۆ بکوژم!

لەو کاتەدا دەستەکانی دەلەرزی و پێیەکانی لەسەر زەویدا لەنگەری نەدەگرت، باری دەروونی تێکشکا، لە کەسێکی نەخۆش دەچوو، کە نکارێت تژی بە سییەکانی هەناسە هەڵمژێت، پێدەچوو خۆشی لەناو خێزانەکەیدا کێشەیەکی کۆمەڵایەتی هەبێت.

ئەو چرکە بە چرکە پتر دەشێوا و دەلەرزی، ژیانی لە پێش چاوی ڕەش دەبوو، چونکە کە ڕابردووی ئومێد ڕەشپۆشی دەهاتەوە بەرچاو، ڕۆژ بە ڕۆژ و سات بە سات هەموو ئەم دیمەنانەی، کە لەگەڵ ئومێددا لەبەردەم شوێنی کتێبفرۆشییەکەیدا، کە بن دیواری دادگە بوو، کاریگەرییەکانی ئومێد و ئەوان ڕۆژانی لەگەڵ ئەودا دەهاتەوە یاد کە چۆن ئەوی لە مفەوەز ئەمنێکەوە کردبوو بە خوێندەوارێکی باش و بە سەلیقە و لە مرۆڤێکی دڕندەوە کردی بە مرۆڤێکی بە ویژدان و لایەنگری ئەدەبی مرۆڤایەتی.

ئەو هەموو ڕۆمانە زیندووانەی دنیا، کە خوێندبوویەوە سۆزی بۆ مرۆڤی ستەملێکراو زیاتر کردبوو، هەستی

بە ئازارەکانی مرۆڤان دەکرد، لە ئاست ستەم و ڕکی کوێرانە بووبوو بە بەرەنگارییان، بۆیە کە لە گۆشەیەکی غاباتی کوران پێکەوە ڕۆنیشتن، کاتەکەشی نزیك نیوەڕۆ بوو، بۆیە تۆزێك لە ئاستی هاتنی یەکەمجاری ئارامتر بووەوە، غاباتەکە لە چەند قوتابییەك زیاتری لێنەبوو، کە بۆ تاقیکردنەوەی بەکالۆریای شەشی ئامادەیی لەبن سێبەری دارە بەرزەکاندا وانەکانی خۆیان دەور دەکردەوە.

چیاد دەستی نەگرت، مامۆستا ڕۆشنبیرەکەی خۆی لەناو ببات، ئەگەرچی ڕاشیانسپاردبێت و جۆری کارەکەی ئەویش لەگەڵ کوشتن و لەناوبردنی جەستەی مرۆڤێك، کە بۆ ئەوان جێی مەترسی بێت لە هەموو بەها و هێزی مرۆڤایەتی و بەزەیی پێهاتنەوە و هەموو جۆرە سۆزێك هیچ بنەمایەکی مرۆیی و ڕەوشتمەندی ڕەچاو نەدەکرد، هەموو مەبەستێك بە هەر شێوە و جۆرێك بە ڕەوا دەبینرا، کەچی لەو دەمەدا کە خۆی بۆ کوشتنی ئەو ئامادە دەکرد و دەیویست ویژدان و هەستە شاردراوەکانی خۆی ڤەشارێت، هەستەکانی خۆی بمرێنێت، بەڵام لە چرکە ساتێکی خێرادا گەڕایەوە، بۆ پۆلەکەی خۆی و بینی مامۆستای زمانی عارەبی حەمەدەمینە فەندی لەوانەی زمانی عارەبیدا لەسەر تەختەڕەش نووسیبووی (من علمني حرفا سرت له عبدا-

واتە ئەوەی پیتێکم فێر بکات دەبمە بەندەی ئەو)، کە دەبووایە هەموو قوتابیان، ئەم بابەتە داڕشتنێکی لەبارەوە بنووسن ئەویش بە درێژایی کاتی وانەکە بیری کردەوە، مێشکی خۆی دەگوشی و زۆری لە خۆی دەکرد، نەیتوانی تەنانەت یەك پەیڤانیش بنووسێت، تاوەکوو لە کۆتایی وانەکەدا نووسی (أنا عبدك المطيع يا أستاذي الفاضل لقد علمتني كثيرا- واتە: من خزمەتکاری گوێڕایەڵی تۆم، مامۆستا ئازیزەکەم، تۆ زۆرت فێرکردم) ئێستەش هەر وا دەزانێت ئەو کاتەیە، ئەوەش مامۆستایەکی دیکەیەتی و دەبێت بە ڕاستی ببێتە خزمەتکار و کۆیلەی ئەوەك بیکوژێت و چاکە و ویژدانی خۆشی زیندە بەچاڵ بکات.

ئەو دەمەی لە مەخموور بوو، زۆر حەزی لە خوێندن نەبوو، بگرە قوتابییەکی تەمبەڵ بوو، هەرچۆنێك بوو بە هۆی هەڕەشەی باببیەوە، قۆناخی ناوەندی تەواو کرد، لە خێزانەکەشیدا برایەکیان خوێندی و کۆلێجی تەواو کرد، دوایی بوو بە ئەفسەر، برایەکی دیکەیشیان بوو بە مفەوەزی ئەمن و ڕەوانەی موسڵ کرا.

چیاد بە هۆی براکانییەوە، کە ئەندامی لە پێشی حیزبی بەعس بوون، لە ئەمنی مەخموور وەرگیرا، جا لەبەرئەوەی تەنیا دەرچووی قۆناخی ناوەندی بوو، سەرەتا بوو بە ئەمین، ئەمەش یەکەمین پلەی ئەو کەسە بوو،

کە دەبووە ئەمن.
دوای ماوەیەك ڕەوانەی هەولێریان کرد، بۆ تەواوکردنی خولی مفەوەزی، دوای ئەوە هەر لە هەولێر مایەوە، ڤێجا فایلی کتێبفرۆشانی هەولێری پێ سپێردرا، دوای وەرگرتنی ئەو ئەرکە بە هۆی مامۆستا و ڕاهێنەری تایبەت بە خۆیان فێری خوێندنەوە و نووسینی زمانی کوردییان کرد، هەروەها زانیارییان لەبارەی ئەدەبی کوردی و نووسەران و نووسەرانی جیهان و کتێبناسی فێرکرد، تاوەکوو بکارێت وەك خوێندەوارێك بێتە ناو کتێبفرۆشەکان، میناك خوێندەوارێکی ڕۆشنبیریش بیناسن و متمانەی پێبکەن و وا بزانن ئەو بۆ زەوق و ئارەزووی خۆی بەناو دنیای کتێبفرۆشەکاندا دەگەڕێت، ئەمەشی بۆ چووە سەر، دواییش ئومێد لە هەمووان پتر فێری خوێندنەوەی باش و زانیاریی بە سوودی کرد، چونکە چیاد تەنیا ناوەندی تەواو کردبوو، بۆ سەرکەوتنی کارەکەیشی، دەبووایە دائیرەی ئەمن بیکاتە کەسێکی ڕۆشنبیر.
ئەگەرچی هێشتە نەبووبوو بەو ڕۆشنبیرە، کە بتوانێت ناوەڕۆکی هەموو جۆرە کتێبێك وەربگرێت و تێی بگات، بەڵام ئومێد بێ ئەوەی بزانێت، کە ئەو بۆ نێو دنیای ئەوان دانراوە تا هەموو نهێنییەکانیان بزانێت، چونکە لای ئەوان ئەو توێژە کاریگەرییان بەسەر

چینی خوێندەوار و ڕۆشنبیرانەوە هەبوو، دەیانتوانی کار لە هۆشیاربوونەوەی خەڵك بکەن، بەتایبەتیش نووسەران و هونەرمەندان، تەنانەت هەر ئەو کتێبفرۆشانەش کە دەبنە خۆراکی ڕۆشنبیری مامۆستا و قوتابیان، ڕاستەوخۆش کاریگەرییان بە گەنجانەوە هەیە، بۆیە حیزبی بەعس لە ڕێگەی دایەرەی ئەمنەوە دەستی خستبووە ناو کتێبفرۆشانی هەولێرەوە، ئەمەش لە ڕێگەی مفەوەز چیادەوە بوو.

ئومێد و کتێبفرۆشانی دیکەیش، کە چیاد هاموشۆی هەمووانی دەکرد، وەك کڕیارێکی ڕۆشنبیر و ئاشق بە کتێب و ڕۆشنبیری لە هەمووان کتێبی دەکڕی، لای هەمووانیش وەك خوێندەوارێکی باش و ڕۆشنبیرێکی دژە دەسەڵات و تێگەیشتوو، وەك کەسێکی داکۆکیکار لە کورد وێنای خۆی خستبووە پێش چاوی هەمووانەوە، وەلێ ئومێد و کەسانی دیکەیش بە ناوی ڕاستەقینەی خۆیان نەیاندەناسی، بگرە لای ئەوان ناوی عەباس ئەلسوڵتانی بوو، کە خۆی وەك جێگری ئەفسەری سوپا پێ ناساندبوون.

* * *

ئەو دەمەی کە چیاد هاتە بەردەم ئومێد و لە غاباتی کوران یەکدییان بینی، دوای گوتووێژ و یەکدی بینینێکی کورت، دەمانچەکەی بەر پشتی دەرهێنا و بە دەستێکی لەرزۆك و دڵێکی وێران و دەروونێکی ناڕەحەتەوە، کە دڵی لە جاران خێراتر لێی دەدا، بە زمانێکی پچڕ پچڕ و شپرزەوە، کەسایەتیی خۆی و ناوی ڕاستەقینە و ئامانجی کوشتنەکەی و پلە و شوێنی کارەکەی خۆی بە ئومێد گوت، ڤێجا پێی ڕاگەیاند، کە بۆ کوشتنی ئەو ڕایانسپاردووە، ئێستەکەش کۆتایی پلانەکەیە.

لەو دەمەدا هەردووکیان لە دۆخی ئاسایی خۆیان نەمانەوە، بکوژ و کوژراو، جەللاد و قوربانی، هەردووکیان هەستیان بە خۆیان کرد، مرۆڤانێکی ئاسایی نین، ئومێد هەرگیز بیری بۆ ئەوە نەدەچوو، کە ئەمە ڕاستییەکە بێت، بگرە تا ئەو دەمەش هەر عەباس ئەلسوڵتانی ڕۆشنبیر و خوێندەوارەکەی جاران بوو، کە میناك مامۆستا و قوتابی ڕەفتاریان لەگەڵ یەکدی دەکرد.

چیاد لە ئومێد خراتری بەسەرهات، تەنانەت خۆی بڕوای بە خۆی نەبوو، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ببێتە بکوژی مامۆستاکەی خۆی، ئیدی ئەوە چییە ئەو دەیبینێت، ئەوە چۆن ڕوویداوە، ئەو ڕۆڵە چییە، کە

ئەو دەبینێت، لەو دەمەدا هەستی بەوە کرد، کە قورساییەکی زۆر کەوتووەتە سەر شانەکانی، خەریکە قاچەکانی لەنگەر ناگرن و ناتوانن بە پێوە بوەستن، ئینجا وا خۆی وەها دەبینێتەوە، کە لە کۆتایی ڕۆڵی شانۆگەرییەکدایە و ناتوانێت چی دی لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێت، ئیدی دەبێت لە نواندنی ئەم ڕۆڵی شانۆگەرییەدا بوەستێت و چی دی نەیتوانی پێچەوانەی هەست و نەستە شاردراوەکانی خۆی بێت، بۆیە کە ڕووی دەمانچەکەی ئاڕاستەی سینگی ئومێد کردبوو، بە ڕاسپاردەیەکی مێشکی لایدا و نەیتوانی ئەو کوشتنە جێبەجێ بکات.

لەو کاتەدا ئەوەی هاتە بیر، کە تاوانی مامۆستاکەی تەنیا ئەوەیە، کە کوردە و شاعیرە و خەڵکی فێری خوێندنەوە و ڕۆشنبیری دەکات و قوتابیان بە ئاڕاستەی سەری ڕمی شۆڕش هان دەدات و لایەنگری شۆڕشی کوردە و مانەوەشی بۆ دائیرەی ئەمن و دەسەڵاتی سیاسی بەعس زیانبەخشە، چونکە بە گرتنیشی نەیانتوانی دەستەمۆی بکەن و کاریگەری نەهێڵن بەسەر ڕۆشنبیری و هۆشیاری نەتەوەیی کورد، ئەوا ئەو لەبری ئەوان، ئەم ئەرکە دەبینێت و ئەویش لە ڕۆشنبیرێکی سەرەتاییەوە بەم ڕۆشنبیرییە سادەیە، مامۆستاکەی کە ئومێد بوو، لە هەموو کتێبفرۆشەکانی دیکە پتر

توانـی فێـری ڕۆشـنبیری جیهانـی و مرۆیـی بـكات و سـەتان ڕۆمانـی ئەدەبـی مرۆیـی پـێ بناسـێنێت.
ئێسـتێ ئـەو لـەو چركەسـاتەدا، چـۆن دەتوانێت دژ بـە ناخی خۆیـدا تاوانێـك بـكات، كـە ببێتـە تۆمارێكـی نامرۆیـی و لەكاتێكـدا ئـەو لەسـەر دەسـتی مامۆسـتاكەی فێـری ئەدەبـی مرۆڤدۆسـتی كرابێـت، ئێسـتەكە چـۆن وا بـە سـووك و سـانایی دەسـتی دەچێتـە خوێنـی ئـەو و لەسـەر دنیـا بیسـڕێتەوە، بۆیـە ئـەو دەمـەی دەمانچەكـەی ڕووی لـە سـینگی ئومێـد كـرد، بـۆ مـاوەی چەنـد خولەكێـك شڵەژا، هەمـوو گیانـی تێكقـژقـژا، دەسـتەكانی كەوتنـە لـەرزە، خەریـك بـوو بەربێتـەوە، بـەڵام خـۆی گرتـەوە، ئارەقەیەكـی ڕەش و شـینی دەردا، هاوسـەنگی خـۆی پـێ ڕاناگیـرا، نەیتوانـی بیتەقێنێـت. ئومێـد زۆر داوای لێكـرد، كـە دەسـتی نەگێڕێتـە دواوە و بیكوژێـت و لـە كـۆڵ خەمەكانـی دنیـای بكاتـەوە، مـادام بـۆ كوشـتنی ئـەو ڕاسـپێردراوە، هیـچ چارەیەكیشـی نییـە، ئیـدی ئـەو لـە خەمـەكان و دژواری و ناڕەحەتـی ژیـان ڕزگاری دەبێـت و ئەویـش ئافەرینـی خـۆی وەردەگرێـت، چونكـە ئومێـد دەیزانـی تـازە ئـەو كەوتووەتـە نـاو بازنـەی مەرگ و ئەگەر چیـاد نەیكوژێـت، ئـەوا دائیـرەی ئەمـن هـەروا بـە سـانایی وازی لێناهێنـن، لـە تۆڵـەی نەكوشـتنی ئـەودا، سـەرەتا چیـاد لەنـاو دەبـەن، كـە فەرمانـی ئـەوان بەجێناهێنێـت، دواییـش

هەروا ناهێڵن ئومێدیش دوای ئەوەی نهێنی کوشتنی خۆی زانی ئیدی بتوانێت ژیانێکی دیکە بژیەت.

چیاد لەو چرکەساتەدا، هەموو ئەم ڕۆژ و سات و ئەو یادگارییانەی هاتنەوە بیر، کە ئومێد وەك مرۆڤێکی جوان و تێگەیشتوو لە ڕێنوێنیکردن و مۆچیاری و فێرکردنی ئەدەبی مرۆیی و پێدانی سەرچاوەی باش بۆ ئەو، هیچ شتێکی دیکە نەبوو.

چیاد نەیتوانی ئومێد بکوژێت، پەنجەی دۆشاومژەی لەسەر پەلاپیتکەی دەمانچەکەیەوە جامی کرد، دوایش هێزێکی پێچەوانەی ویستی خۆی چرپاندییە گوێی، کە نابێت ئەم تاوانە بکات، دوایی ویژدانی ناهێڵێت لە دنیادا ئاسوودە بێت، ڤێجا پاش مردنی ئومێد ئەو ئەگەر بشمینێت بە ئازارێکی دەروونی و ویژدانێکی مردووموە لە ژیاندا بەردەوامی دەبێت، بۆیە لەو چرکەساتەدا ئەم تەوژمەی بیر و هزر و خەیاڵی تێکەڵ بە دەنگە نادیارییەکە بوو، هەموو پێکەوە کاریان لە ناخی شپرزە و ڕووخاوی کرد و بەربووموە سەر زەوی و لە هۆش خۆی چوو.

ئومێدیش لەو شپرزەتر بوو، مرۆڤێك لەم چرکەساتەدا، کەسێکی دۆست و نزیکی، کە خۆشەویستی کتێب و ڕۆشنبیری وەك دوو مرۆڤی جوان پێکەوەی گرێ دابوون، ئیستێ وەك بکوژ و دوژمن و گیانکێشی

ئەو بێتە بەرانبەری، پاشان پێچانەوەی ئەو کەسە بێت، کە ئەو وێنای کردبوو، بێ و خۆی وەك کارمەندی تۆقێنەرترین دەزگە پێ بناسێنێت و فەرمانی دەزگەکەی پێ ڕابگەیەنێت، کە بۆ مەرگی ئەو نێردراوە.
ئەوسا بزانێت کە ئەو عەباس ئەلسولتانی ڕۆشنبیر و دژە دەسەڵات نییە، کە ئەو خۆی پێناساندبوو، بگرە کەسێکی دیکەیە، تەنها دەمامکەکەی لە ڕوخساری داماڵیوە، ئێستە وا خۆی لێ ئاشکرا کردووە، ناوی چیادە و پیاوی دەزگەی ئەمنە و بۆ کوشتنی ئەو نێردراوە، ئینجا ئومێد، کە ئەو دۆخە پێچەوانە دەبینێت، بە چ جۆرێك ئەم دیمەنە نەخوازراوە بخوێنێتەوە.
داخۆ لە چ دۆخێکی دەروونی و چۆن شپرزە و دڵەڕاوکێ دەبێت، هەست بە چ ترسێك بکات، چۆن ئەو دنیایەی لە پێش چاویدا ڕەش نابێت، کە بزانێت کەسێك تا دوێنێ متمانەی پێکردووە و بە ڕۆشنبیری زانیووە و پێی وابووە، کەسێکی دژ بە دەوڵەتە و ئێستێ پێچەوانە بێتەوە، وەك سیخوڕێکی سەختترین دەزگەی داپڵۆسێنەر خۆی پێ بناسێنێت و بە بکوژی خۆی ببینێ.
سەختە تۆ هەست بەوە بکەیت، هەر دەبێت بکوژرێیت، سەختە بەجێهێشتنی ژیان و ئەو رۆحە شیرینەی، کە هەموو مرۆڤێك حەز بە مانەوە دەکات، لە دۆخێکی لەم

جۆرەدا مرۆڤ دنیای بەسەردا دەڕوخێت و هەموو ژیانی لە چرکەساتێکدا لێ دەبێتە دۆزەخ، هەناسەبڕکێ دەبێت و دەرگیری دڵەکوتەی دەکات و تەواو خۆی ڕادەستی مەرگ دەکات و بڕوای بە مانەوەی خۆی نامێنێت لە ژیاندا.

ئەویش لەو دەمەدا، لەم ڕووخانە دەروونییەدا کە بزانێت کەسێك هاتووە، کە جێگەی متمانەی بووە و لەپڕ ڕووی دەمانچەکەی ئاڕاستەی سینگی دەکات و بواری دەربازبوونیشی نادات، بۆیە ئەویش لەم شپرزەییە و داڕمانە دەروونییەدا، کە چیاد ڕووبەڕووی بووەتەوە کە تا ئەو چرکەساتەش لای ئەو عەباس ئەلسوڵتانی ڕۆشنبیر بوو.

هەردووکیان تووشی هەرەسی دەروونی دەبن و بەسەر یەکدیدا بەردەبنەوە و بێ ئاگا باوەش بە یەکدیدا دەکەن، هەردووکیان لە باوەشی یەکدییەوە پێکەوە بەردەبنەوە سەر زەوی و دەبوورێنەوە. کاتەکەش قرچەی گەرمای نیوەڕۆیە و قوتابیان بۆ نانخواردن چوونەتەوە ماڵەوە، وا پێدەچوو ئەو دەمە، هەر تەنیا ئەو دووانە، لەژێر سێبەری درەختە بەرزەکانی غاباتدا گیانییان شەلاّلی ئارەقەی گەرمای ئەو ڕۆژە بێت و کەوتبنە نێو دنیای خەون و داهاتووی نادیاری خۆیان.

چیاد لە خەونەکەیدا گەڕابووەوە ساتەکانی پێش

هاتنی بۆ غابات، بەردەوام لە مشتومڕدابوو لەگەڵ دەروونی خۆی و سەرومڕ لەبەر خۆیەوە لێکی دەدایەوە، ئەگەر بیکوژێت چی دەبێت و ئەگەر نەشیکوژێت چی دەبێت، بۆیە هەردەم لێکدانەوە و وشەی بیکوژم .. نەیکوژم لە مێشك و هزریدا دووبارە دەبوونەوە، تەنانەت لەو چرکەساتەشدا کە ئێستە وا هۆشی لای خۆی نییە، هەر لەو لێکدانەوەیەدا دەخولێتەوە و نازانێت دوا بڕیاری بە کامە لادا بدات، هێشتە خۆی تەواو پێ یەکلایی نەکراوەتەوە.
ئومێدیش کەوتبووە دڵەڕاوکێی نێوان مردن و مانەوە، لە نێوان لێکدانەوەی کوشتن و نەکوشتنی بەدەستی چیاد، یاخود عەباس ئەلسولتانی ڕۆشنبیر و کڕیاری کتێبەکانی، نەیدەتوانی هێڵی کوشتن و نەکوشتن، یان ژیان و مردن، یاخۆ تاریکی و ڕووناکی لێك دی جیابکاتەوە و خەونەکانی مێشکی پچڕ پچڕ و جڕنا و فڕنا و ناخۆش بوون، وای دەهاتە خەونی، کە لە خاکێکی پڕ لە دڕك و سیخناخ لە قۆرت و هەوراز و نشێوانە و خەریکە بەردەبێتەوە نێو کەندەڵانێکی نوتەك و تاریك، ئەویش هەر ڕایدەکرد تا لەم شوێنە ناخۆشە ڕزگاری بێت و بەرەو مێرگی سەوز و باخ و باخچەی جوان و سروشتێکی جوان بپەڕێتەوە، بەڵام هێشتە هەستی دەکرد، کە چیاد یاخۆ عەباس

ئەلسولّتانی بە دوایەومیەتی و ناهیڵێت بپەڕێتەوە، بۆ خاکی ئارام و ئۆقرە بگرێت و بحەسێتەوە، وای هەست دەکرد، کە ئەو لە پشتەوە ڕایدەکێشێت و دەیەوێت بیگەڕێنێتەوە ناو ئەو دۆزەخەی، کە بۆیان ئامادە کردبوو، ئەویش هەر غاری دەدا و دەربازی نەدەبوو. چیادیش لەنێو خەونەکانی خۆیدا دەمێک بکوژ و دەمێک کوژراو و دەمێک جەللاد بوو دەمێکیش قوربانی، هێشتاکە لەو خەونەدا نەیدەتوانی تەواو خۆی یەکلایی بکاتەوە.

## (٥)

کە بە ئاگا هاتنەوە، چیاد باوشی بە ئومێد کرد و پێی وت:

- من ڕاسپێردراوم تۆ بکوژم، بەڵام ئەوەتانێ دەستەکانم دەلەرزن، ویژدانم ئازارم دەدات، ئەوەتانێ لە سوێی تۆ بورامەوە و ئاگام لە خۆ نەما، تۆش هەروەها لەو هێدمەیەدا بورایتەوە، ئەوەتانێ هەموو گیانم دەلەرزێت، دەستم ناچێتە مامۆستاکەی خۆم بکوژم، پەنجەی شایەتمانیم پەلاپیتکەی دەمانچە ناتەقێنێت، ناتوانم ئازیزترین کەسم، کە تۆی و فێری خوێندنەوەی قووڵ و ئەدەبی مرۆڤایەتیت کردم لەناو ببەم، ئاخر تۆ فێری ئەوەت کردووم، کە هەر کارێك بکەم، سەرەتا بیری لێبکەمەوە، ئینجا جێبەجێی بکەم، منیش زۆر بیرم لە کوشتنی تۆ کردەوە، هەرچەندی هێنام و بردم و زۆریم لە خۆم کرد نەمتوانی ئەو کارە بکەم، تۆ مێشکی

داخراوی منت کردموە.

ڕاستە من کارمەندی دەزگەی ئەمنم، ئەوانیش ئەندامانیان فێری کوشتن و ڕك و کینە دەکەن و لە مرۆڤایەتی دایدەماڵن، تەنانەت دەست لە نزیکترین کەسانی خۆشیان ناپارێزن، بەڵام من بە هۆی تۆوە هۆشم هاتەوەبەر، تا تۆم نەناسی و نەهاتمە لای تۆ و دۆسیێەی ئێوەی کتێبفرۆشانم پێ نەسپێردرا، وامدەزانی هەرچی ئەوان بڵێن ڕاستە و دەبێت بێ پرسین و بیرکردنەوە جێبەجێی بکەم و وەك فەرمانی سەرۆکی فەرماندەش بوو، کە دەیگوت (نفذ.. لا تناقش)، واتە ئەوان فێری ئەومیان دەکردم، کە بێ بیرکردنەوە جێبەجێی بکەم، تەنانەت گوتووێژیشی لەبارەوە نەکەم، کە زۆرینەی هەرە زۆری فەرمانەکان، نەدەبوو هیچ گوتووێژ یاخۆ قسەیان لەبارەوە بکرێت، دەبووایە کوێرانە بڕیاری ئەوان جێبەجێ بکەین، بەڵام کە تۆم ناسی و بێ ترس چەندان کتێبی هزری و فەلسەفی و ڕۆمانی زیندووی دنیات پێدام، یاخود بۆت دەستنیشان کردم و خوێندمەوە و بەردەوام بیرۆکەت لەبارەی جۆراوجۆری کتێبەکان پێدەدام، ئیدی لەوساوە دنیای ڕۆشنبیری منی گۆڕی و کردمی بە مرۆڤێك، کە نەتوانم کەسی بێ تاوان بکوژم، تەنانەت ئازاری هیچ مرۆڤێکیش بدەم، ئەوە

نییە وام لە بەرانبەرت و ڕاسپاردەی ئەوان جێبەجێ ناکەم و دەستەوەستان هەرچی ڕك و کینەی هەیانە بەرانبەرت من نەتوانم بتخەمە ناو پێچانەوەی نەفرەت و سڕینەوەی ئەوان.

ڕاستە من هەموو ئەم زانیارییانەی لەبارەی تۆ و کتێبفرۆشەکانی دیکەوە وەك ڕاپۆرت بۆ سەرەوەی خۆم دەنووسی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش وردە وردە هزری مرۆیی بەسەرمدا زاڵ بوو، تا ئەو ڕادەیەی نەتوانم ببمە ئامرازێك بۆ ستەم.

تۆ فێرت کردم ڕۆمان و چیرۆك بخوێنمەوە، بەڵام نەمتوانی ببم بە نووسەر، بەڵکو بە هۆی هاندانی تۆ بوو، ڕۆژ بە ڕۆژ یاداشتەکانی خۆم نووسییەوە.

- ئاخر تۆ وەك مرۆڤێکی لەسەرخۆ و شیرین، کە کەسێکی بێ زیان و دژی جەور و ستەمی ڕژێم بیت و لایەنگری خێر و خاوەن ویژدانێکی زیندوو و کەسێکی تێگەیشتوو و ڕۆشنبیر بیت، بۆیە متمانەم پێکردی، من چ بزانم تۆ مەفەوەزی ئەمنی، لەلام وەك جێگری ئەفسەری عێراقی دەرکەوتی و متمانەم پێکردی، دواییش کەسایەتییەکی دیکە دەرچوویت، ئەوەی من وێنای تۆم کردبوو، پێچەوانەی خۆت دەرچووی، تەنانەت ناویشت لای من عەباس ئەلسوڵتانی بوو نەك چیاد.

- ئێستەش هەر ئەو مرۆڤەم کە تۆ لە زەمینی خۆتدا وێنات کردووە، هەر عەباس ئەلسولتانییەکەی لای تۆم، من لەتۆ زیاتر حەز بە ژیان دەکەم، بەڵام ڕکم لە ژیانی نامەردی دەبێتەوە، لە ژیانمدا زولمم لە کەس نەکردووە، لەبەر پرسی ژیانیشە بوومەتە ئەمن، بەڵام مرۆڤم و ڕکم لە کوشتنی مرۆڤە.

لەو دەمەدا، کە هاتووم تۆ بکوژم، مسۆگەر دەزانم ئەگەر من تۆ نەکوژم، ئەوان ئەم تۆڵەیەم لێدەکەنەوە و ناهێڵن من بژیم، بگرە لەو تۆڵەیەی، کە قسەی ئەوان جێبەجێ ناکەم لەناوم دەبەن و لەسەر دنیا دەمسڕنەوە، چونکە لای ئەوان پەژیوان بوونەوە و ڕەتکردنەوە نییە، ئەگەر فەرمانی ئەوان جێبەجێ نەکەیت، دەبێت بە تەمای ژیانی خۆت نەبیت، منیش دەستەوەستانم و ناتوانم تۆ بکوژم، چونکە دڵنیام، کە دوای ئەم کارە تا مردن دەبێت ئازاری ویژدان بچێژم، خۆشم ئەمێستا وا لە دۆخێکی دەروونی ڕووخاودام و ناخم هەپڕوون بە هەپڕوون بووە، لەو دەمەدا لە دۆخی هەرەس و ڕووخاندام و لە ژیان بێزارم و ئیدی نامەوێت بژیم.

- ئاخر تۆ ئەگەر من نەکوژیت، ئەو نامرۆڤانە چیدی ناهێڵن تۆ لە ژیاندا بمێنیت، منیش نامەوێت لە پێناوی مندا تۆ خۆت بکەیتە قوربانی.

وەرە بمکوژە و لەم ژیانە سەختەدا بۆ خۆم ڕزگارم دەبێت و تا دنیاش مابێت ئەوا دەبم بە شەهیدی بیروباوەڕ و هێمای قوربانی بۆ میللەتەکەم.

- نەخێر، تۆ شایانی ژیانی، سەدان قوتابی وەك من پێویستیان بە تۆیە تا ڕێگەی ڕووناکی ژیانیان پیشان بدەیت.

- بۆچی ئێوەش کێشەتان هەیە، ئەدی حیزبی بەعس هەموو شتێکی بۆ ئێوە دابین نەکردووە! پێم ناڵێی ئێوە لە چیتان کەمە.

- ئومێد گیان ئێمەش مرۆڤین و لەم کۆمەڵگە دواکەوتوومدا دەژین. کە پێی دەڵێن ڕۆژهەڵاتی ناوین، بە تایبەتی ئێمەی عارەبان، کە هێشتە زۆرینەمان ئەقڵیەتی خێڵەکی بەسەریدا زاڵە و دەشبێت بەو داب و نەریتە دواکەوتووانە پابەند بین، ئێمەش قوربانی ئەم ئەقڵیەتەین. تۆ وا دەزانی من کە لە هەولێر مووچەیەکی چاکم هەیە و پیاوی ئەمنم و خانوو و ئۆتۆمبێلمان بۆ دابین کراوە، ئاخۆ هەموو شتێك بە دڵی ئێمەیە، وا دەزانی ئێمە هیچ گرفتێکمان نییە، خۆ ئەگەر کێشەی سیاسیشمان نەبێت، لەو کۆمەڵگە داخراو و دواکەوتووەی ئێمەدا نوقمی دەیان کێشەی سەختی کۆمەڵایەتین.

- بە خوا ڕاستە هەمووومان کوشتەی کۆمەڵگەی

دواکەوتووی ڕۆژهەڵاتین، ئێمەی کوردیش جیا لەوەی ژێر دەستەی ئێوەین و لەوەتەی هەین چەوساوەین و لە پێناوی مانەوەی خۆماندا خەبات دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەمەش هێشتاکە کوشتەی ئەو داب و نەریتە ڕۆژهەڵاتییەین، ئێمەش هەر قوربانی دەستی ئێوە و دواکەوتووی داب و نەریتین و زیانی زۆری لێداوین، ئەوە نییە لەسەر پێناسەی نەتەوەییەوە دەمانکوژن و ناهێڵن دەنگ و ڕەنگمان هەبێت، ئێوە دەمانسڕنەوە، تا ئێوەی سەردەست بە ئاسوودەیی بژین.

- من ناتوانم کێشەی کۆمەڵایەتی خۆمت بۆ باس بکەم، چونکە پێم ناکرێت لێی دەربازبم و هەرچیم هەیە وا لەم دەفتەرەی یاداشتنامەیەدا نووسیومەتەوە، کە هێناومە بیدەمە تۆ تا لە دوای من لای تۆ بمێنێتەوە و لە ژیان و نهێنی من بگەیت.

- بۆچی تۆ بڕیاری چیت داوە؟

- بڕیارم داوە من لەجیاتی تۆ گیانی خۆم ببەخشم و لەو دۆزەخەی لە ناخمدایە ڕزگار بم.

- با هەردووکمان پێکەوە بمرین، بمکوژە ئینجا دوایی خۆشت بکوژە، چونکە ئەگەر تۆ خۆشت بکوژیت، ئەوە دایەرەی ئەمنە و هەر ناهێڵن من بژیم و هەر نەبێت لەسەر گیانی تۆ دەمکوژن، یان کە دەمکوژن بە تۆڵەی مەرگی تۆ لە دنیادا دەمسڕنەوە

و بە تۆمەتی کوشتنی تۆش تاوانبارم دەکەن.
- نەخێر .. من دەستم ناچێتە خوێنی تۆوە، کە خۆشم دەکوژم، دەمانچەکەم شوێن پەنجەی خۆمی پێوە دەبێت و ناتوانن تۆ بە بکوژی من لە قەڵەم بدەن، لێکۆڵەرەوانی تاوان دەزانن من بەدەستی خۆم کوژراوم.
- پیاوی چاکبە دنیا لە خۆم و خۆت ڕەش مەکە، هێشتە تەمەنێکی زۆرت لە پێشدا ماوە، ژیان خۆشە بۆچی لەسەر من خۆت دەکەیتە قوربانی، با کێشەی کۆمەڵایەتیشت هەبێت، خۆ هەموو کێشەیەك چارەسەری هەیە و خوای گەورەش سەبر و ئارامی بۆ مرۆڤ داناوە.
- ئەوە مەسەلەی عیشق و خۆشەویستییە، ئاخر من دوای مەرگی عومیشەی خۆشەویستم ئیتر چی لە ژیان بکەم، مانەوەم بۆچی باشە، تازە بۆ من دوای ئەو ژیان چ تام و خۆشییەکی هەیە.
- ئەوە کۆتایی ژیان نییە، خوا سەبوریشی داناوە، خوا یارمەتیدەرە لەبیری دەکەیت.
- ناتوانم لەبیری بکەم، ئیتر ژیانم ناوێت با سەربردەی خۆمت پێ بڵێم و دەمەوێت بیزانیت.
- فەرموو حەزدەکەم بیزانم.
- من چەندان ساڵە لە شوێنی جاسمی برا شەهیدەکەم،

کە ئەفسەری سوپا بوو، لە شەڕی ئێراندا لە قادسیەی سەدام شەهید بوو، دوای ئەوە بە هۆی داو و نەریتی عەشایەری خۆفەی خێزانەکەی لە من مارە کرایەوە، لە هەمان کاتدا بوومە مام و باوکی منداڵەکانی ئەو، بۆیە نەمتوانی ڕەتی بکەمەوە، لەگەڵ ئەمەش بەو هۆیەوە لە عومیشەی خۆشەویستم دابڕام، ئەویش چەندان ساڵ شووی نەکرد، دوایی بە خورتی دایانە خەڵەفی ئامۆزام، ئەگەرچی ئەو بەختەوەر نەبوو لە ژیانی هاوسەریدا لەگەڵ خەڵەف، بەڵام لەگەڵیدا دەژیا و پێکەوە مانەوە و هیچ منداڵیشی لێی نەبوو، خەڵەف زۆریشی خۆشدەویست، بەڵام ئەو هێشتە منی خۆشدەویست و مەیلی خەڵەفی نەبوو، منیش هەموو جار کە دەچوومەوە دەمدیت، هێشتا دڵمان بۆ یەکدی لێی دەدا و هەردووکمان عاشقی یەکدی بووین، بەڵام چەند ساڵێکە نەخۆش کەوت و دەرگیری شێرپەنجە بوو، تا لەم هەفتەی ڕابردوو هەواڵیان دامێ، کە گیانی سپاردووە و ڕێوڕەسمی پرسەمان بۆ دانا.

من دوای ئەو هەستدەکەم لەسەر دنیادا نەماوم و سات دوای سات بیر لە خۆکوشتن و چوونە لای ئەو دەکەمەوە، ئێستەش ئەمە باشترین دەرفەتە، کە ناتوانم تۆ بکوژم، بیرم بۆ ئەوە جێگیر بووە،

كە لە جیاتی تۆ خۆم بکوژم و بە عومیشە بگەم، خۆ ئەگەر لە دنیاش بە یەکدی نەگەیشتین لەو دنیای دیکەدا، ئەوە دەخوازم کە خوای گەورە بە یەکدیمان شاد بکاتەوە، ئیتر ژیان بۆ من بەسە و نامەوێت، با بۆ تۆ بێت و تۆ قابیلی مانەوەی نەك من.

- بۆچی دوای شووکردنی هەر یەکدیتان خۆ شد ه و یست ؟

- بەڵێ هێشتاکە گیان و دڵی یەکدی بووین، بە هۆی ئەوەوە هەناسەم هەڵدەمژی.

- ئەویش وەك تۆ لەسەر عیشقی خۆی مابوو؟

- ئەویش بێ من نەیدەتوانی بژی و هەموو چوونەوەیەکم بۆ مەخموور یەکدیمان دەدیت و خۆشەویستی خۆمان بۆ یەکدی نوێ دەکردەوە و پەیمانمان بە یەکدی دەدا کە خۆشەویستیمان بۆ گڵ بێت، ئیدی دوای ئەو من چۆن بژیم.

- هەوڵ بدە لەبیری بکەیت و ئیتر بۆ منداڵەکانی براکەت بژی و ئەوان پێویستیان بە باوکێك هەیە، تاوەکوو لە سایەتدا بحەوێنەوە، تۆش ببە بەو باوکە دڵسۆزەی ئەوان.

- ئەوان دوای من هیچ کێشەیان نییە، پاشان وەك نەریتی عەشایەری دەچنەوە لایماڵی باوکم و بۆ خۆیان دەژین.

- ئاخر ژیان شیرینە، خوای گەورەش دنیای وا داناوە، مرۆڤ حەزی لە ژیانە، تۆش هێشتاکە زۆرت ماوە لەم ژیانەدا، هەمووشمان دەمرین، ئەویش ماوەی خۆی تەواو بوو، ئیتر تۆش وەرەوە سەرخۆت و دەستبەرداری ژیان مەبە، ئەو نەخۆشییەکەی لێ بوو بە هۆکاری مەرگ و تەمەنی هەر هێندە بووە، کە خوای گەورە بۆی نووسیوە.

- ئەم دنیایە بۆ من هیچ خۆشییەکی تێدا نەما، بۆیە لەجیاتی ئەوەی تۆ بکوژم، من خۆم پێویستیم بە مردن هەیە و من شایانی ئەو مردنەم نەك تۆ.

ئومێد زۆر هەوڵی لەگەڵ چیاد دا، بەڵام نەیتوانی لەم بڕیارە پەژیوانی بکاتەوە، بۆیە چی دی گفتووێژکەیان ئەنجامی ئەرێنی نەبوو، ئەو هەر لەسەر بڕیارەکەیدا مکوڕ بوو.

ئومێد هەوڵیدا تاوی بداتێ و پڕ بداتە دەمانچەکەی، بەڵام چیاد خۆی لە دەستی ڕاپچکوڕی و بە خێرایی دەمانچەکەی خستە سەر سینگی خۆی و گوللەیەکی لەلای چەپی خۆیدا و بەدەم هاوارێکی توندەوە کەوتە سەر زەوی، دەفتەری یاداشتنامەکەشی کە لە ناو دەستی بوو تا بیداتە ئومێد، لە دەستی بەربووەوە و کەوتە سەر زەوی.

ئومێد بە پەلەپروزێ دەفتەری یاداشتنامەکەی

هەڵگرتەوە و دەستی لە دەمانچەکەی نەدا و بە خێرایی لەو ناوە دوورکەوتەوە.
ناوە ناوە ئاوڕێکی دەدایەوە تا بزانێت کێ بە دوایدا دێت و دەیگرێ و دەیباتە بنکەی پۆلیس، یان بۆ دائیرەی ئەمن، ئەو ترسی لەوە بوو، کە لەم پلانەی کوشتنی ئەودا، کە چیادییان ناردبوو چەند کەسێکیان لە چاودێریکردنی ئەم پڕۆژەی کوشتنەیدا لە دەوروبەری ئەم شوێنە دانابن و ئێستەکە ببینن، کە ئەو نەکوژراوە و لەجیاتی ئەو چیاد بووەتە کوژراوەکە، بێن بیگرن و خۆشیان ببن بە شاهێدی ئەم کوشتنە و تاوانەکەش پێچەوانە بگێڕنەوە و بە ملی ئەویدا بنێن.
ئومێد بە شڵەژاوی و دەروونێکی ڕووخاوەوە بە ڕێگەدا دەڕۆیشت، هەموو گیانی دەلەرزی و هاوسەنگی ڕۆیشتنی نەمابوو، جار جار بەلادا دەهات، بەڵام خۆی هان دەدا تا لەم شوێنە دووربکەوێتەوە، لەگەڵ ئەمەش زۆر سکی بە چیاد سووتا و لە ناخەوە بۆی پەرۆش بوو، وێنەکانی ڕابردووی وێنە وێنە و دیمەن دوای دیمەن دەکەوتەوە ناو یادگەی و بۆی گریا و زانی، کە ئەو پیاوە بە نەمانی خۆشەویستەکەی ژیانی لا بوو بە دۆزەخ و نەیتوانی دوای ئەو چی دیکە لە ژیاندا بمێنێتەوە.

ئەویش ئەگەرچی لەم کوشتنەدا ڕزگاری بوو و وای بیرکردەوە، ئەگەر لەبەر خۆشەویستی چیاد نەبووایە و ژیانی لە پێناوی عەشقەکەیدا فڕێ نەدابا و ئەگەر کەسێکی دیکە بووایە، ئەمێستە وا ئەوبوو کوژرابوو، بۆیە هەر دەڕۆیشت و دەیویست خۆی لەم ناوچە ترسناکەدا دوور بخاتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش هەموو گیانی شەلاڵی ئارەقە بوو، جەستەی وەك دارێکی ناو ئاو دەلەرزی، ترس و دڵەڕاوکێ تووشی حەپەسانی کردبوو.
وایدەزانی دنیا هەموو بەسەر ئەودا ڕووخاوە و هەستی بە خۆی نەدەکرد، کە وەك مرۆڤێك لەسەر ئەم دنیایەدا دەژی، بگرە هەستی بە سستی لێدانی دڵی دەکرد و تووشی هەناسەبڕکێ بوو، وەك کەسێك وابوو کەوتبێتە ناو دەریایەکی قووڵ و هیچ مەلە نەزانێ و جار جارە سەری خۆی تۆزێك لەناو ئاوەکە دێنێتە دەرەوە و هەناسەیەکی مانەوە هەڵدەمژێ، دوایی ماندوو دەبێت و دەریاکە جارێکی دیکە ڕایدەکێشێتەوە ناو خۆی، تا تەواو ماندوو دەبێت و هەناسەی نامێنێت و ڕادەستی قەدەری مردن دەبێت.
تا پێی خۆی نایە حەوشەی ماڵەکەی ئەوسا زانی هێشتاکە زیندووە و وا خەریکە وردە وردە دڵی دەست بە لێدان دەکاتەوە. بڕوای بە خۆی نەدەکرد،

هێشتاکە زیندوو بێت و خۆی بە کوژراو و چیادیشی بە بکوژەکە دەهاتەوە پێش چاو. کە تەواو هاتەوە سەر خۆی و دانیشت و خۆی لە ماڵەکەیدا بینیەوە، ئەگەرچی خاتوون لە ماڵەوە نەبوو، لەگەڵ ئەمەش کە زانی وا لە ماڵەکەی خۆیەتی، تۆزێك هەستی بە ئاسوودەیی کرد و پێی حەسیا لە بازنەی مەرگ ڕزگاری بووە، ئەوسا تەواو لەوە دڵنیابوو، کە ئەو کەسەی کوژراوە و نەماوە ئەوا ئەو نییە، بەڵکو چیادی ئەمن و برادەری و کڕیاری بەردەوامی کتێبەکانی و خوێنەری بە توان بوو، هەستی وابوو ئەوە عەباس ئەلسولتانی خوێنەر و ڕۆشنبیرە و چیاد نییە، ئەویش لەم پیلانەدا ڕزگاری بووە، بەڵام لەگەڵ ئەمەش ترسی ڕۆژانی داهاتوو تەنگی پێ هەڵچنی. زانی مادام دایەرەی ئەمن ئەو باوەڕپێکراوەی خۆیان ناردووە بۆ کوشتنی ئەو، دواییش ئەو بێ ویستی ئەوان لە ژیاندا ماوەتەوە، بێگومان هەرچەندە ئەوان هەموو شتێك دەزانن، بەڵام لەوە دڵنیابوو، کە دائیرەی ئەمن هەروا لێناگەڕێ ئەو کارە وا بە سانایی بەسەر ئومێددا تێپەڕێ و تازە دەربازبوونی لە دەستیان زەحمەتە و ئەگەرچی لەوەش دڵنیان، کە چیاد بە دەستی خۆی کوژراوە، بەڵام بۆ تۆمەتبارکردنی ئەو، ئەم تاوانە ئاوەژوو دەکەنەوە و وای بۆ ڕێکدەخەن،

کە ئومێد ببێتە بکوژی چیاد.
کە خاتوونیش هاتەوە ماڵ و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، هێشتە هەردووکیان بڕوایان نەدەکرد، کە ئەوەی لە ژیاندا ماوە ئومێدە و کوژراوەکەش چیادە، یان ئەو عەباس ئەلسولتانییەیە، کە ئەوان دەیانناسی.
شەو و ڕۆژێك خاتوون هەر دڵی دەدایەوە و دەیویست ترسەکەی لێ بڕەوێنێتەوە، لەگەڵ هەندێش پشوو و ئۆقرەی نەما، خەو لە چاوەکانی تۆرا، هەردەم لە چاوەڕوانی هاتنی ئەمن بوو و بیری لە ڕۆژانی ڕەشی داهاتووی خۆی دەکردەوە.

* * *

ئەوجارە ئەوەی بیرهاتەوە کە لە ژوورێکی تاکە کەسیی گرتیگەی ئەمن خۆی دۆزییەوە، ژوورەکە شوێنی ئاودەست بوو، سیخناخ بوو، کردبوویانە شوێنی ئازاردانی دەروونی ئەو کەسانەی، کە تازە دەگیران و دەیانویست لە ترسان هەموو شتێك بدرکێنن، یاخۆ یەکەمین ڕووخانی دەروونی بوو بۆ ئەو، وەلێ هەستی کرد وەك هەمان ژوور نەبوو، کە جاری پێشوو نێزیکەی چل ڕۆژ تیایدا مایەوە. شوێنەکە هێندە بچووك بوو نەیدەتوانی قاچەکانی خۆیشی تێدا درێژبکات، ئەمجارەش خستیانە هەمان ئەو ژوورانەی جێی ئاودەستی کۆن، بەڵام لە ژوورێکی دیکە و شوێنێکی دیکە بوو.

ئەو خەمی ئەوە نەبوو، بە تۆمەتی کوشتنی چیاد خراوەتە ئەم شوێنەوە، خەمی خۆشی نەبوو، بگرە بەرگەی ئەو لێدانەشی دەگرت، کە ڕۆژانە بە چاوبەستراوی دەیانبردە شوێنی فەلاقە و پانکە هەڵواسین و هەموو جۆرە ئازاردانێکی دیکە، تا دان بە تاوانەکەیدا بنێت و لە ئیفادەی خۆیدا بڵێت: بەڵێ، من چیادم کوشتووە، ئەگەرچی ئەوان خۆشیان دەیانزانی، کە چیاد خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناوە، بەڵام دەیانویست لە ڕێگەی ئازاردان و گوشاری دەروونییەوە، ئەو خۆی ناچار بێت بۆ ڕزگاربوونی لەم ئازارە جەستەیی و دەروونییەدا دان بە کوشتنی دابنێت، بەمەش دەیانویست ئومێد لەبەردەم

حاکمی دادگەی ئەمن خۆی وەك بکوژی چیاد بناسێنێت.
ئەوان بە بەردێك دوو چۆلەکەیان دەکوشت، یەکیان تۆڵەی چیادی پیاوی خۆیان لە ئومێد دەکردەوە، ئی دیکەیش بە فەرمی ئومێدیان دەکردە بکوژ و دەیانخستە بەردەم پەتی سێدارە و لە کۆڵیان دەبووەوە، ئەوەی چیاد نەیتوانی جێبەجێی بکات، ئەوان بە فەرمی پیلانەکەیان بۆ نەهێشتنی ئومێد سەربگرێت.
ئومێد خەمی هەموو ئەو ڕۆژە سەختانەی نەبوو، بەرگەشی دەگرت، بگرە تاکە خەمی ئەو تەنیا و تەنیا خاتوون بوو، کە وەك چۆن لە سەفەرەکانیدا بە تەنیا جێی دەهێشت، بەڵام وا ئەمجارە تەنیاییەکەی درێژە دەکێشێت، هەندێك جاریش وا بیری دەکردەوە و وای دەهاتە هزری، کە ئەگەر بە دان پێدانانیش نەبێت، دکارن بڕیاری دادگەی ئەمنی بۆ ڕێکبخەن و بێ دانپیانانی خۆی حوکمی بەسەردا بسەپێنن. ئەوسا، یان لە سێدارەی دەدەن، یاخۆ حوکمی هەتا هەتایی بەسەردا دەسەپێنن، لە هەردوو باریشدا خاتوونی لەدەست دەچێت و جارێکی دیکە نایبینێتەوە، لەبەر هەندێش بوو هەموو بیرکردنەوە و هزر و خەیاڵی بەلای خاتووندا دەشکایەوە.
ئەمنەکان بە ئەفسەر و مفەوەز و بێ پلەکانیشیان، هەموویان ڕکیان لە ئومێد دەبووەوە، کە لێشیان دەدا و ئەشکەنجەیان دەدا، چەشنی دوژمنێکی باوە کوشتەیان

لێیـان دەڕوانـی، ئەویـش هێنـدە بـە ئـازار بـوو، لەبـەر ئێـش و ژانـی جەسـتەی لـە بوونـی خـۆی بێزاربـوو، بـەڵام هێشـتا بەرگـەی ئـازاری دەگـرت، ئـەدی ئـەو ئـازارە ڕۆحییـەی کـە دەیانـدا، ئـەدی ئـەو جەنگـە دەروونییـەی کـە لەگەڵیانـدا دەکـرد، هـەر یەکەمیـن شـەوی بـوو، کـە هێنایانـە ئـەم شـوێنی ئاودەسـتە، جیـا لـەو ئـازارە دەروونییـەی، کـە شـوێنی ئاودەسـتێکی یـەك مەتریـان کردبـووە مـاڵ و جێـی خـەو و لـەم ڕووبـەرە بچووکـەدا گرمۆڵەیـان کردبـوو، تەنانـەت بـۆ خەوتنیـش نەیدەتوانـی قاچەکانـی خـۆی درێـژ بـکات و پشـوویەك بـدات.

لـە ماندووبـوون و ناخۆشـی فەلاقـە و بـە پانکەوەکـردن و لێـدان و شـەق و بـۆن میـزی ژوورەکـە و نسـرمی دیـوار و زەوییەکـەی، بۆیـە نەیدەتوانـی تۆزێـك ئـارام بێتـەوە، هیـچ نەبێـت بـۆ لێـدان و ئەشـکەنجە و فەلاقـە و هەڕەشـەی ڕۆژی دواتـر، جەسـتەی تۆزێـك بحەسـێتەوە، بـەڵام ئەوشـی شـك نەبـرد، هێشـتە جیـا لـەوەش زیاتریـان پێـی دەکـرد، پتـر لێـی کۆڵـدار بوون، هـەر کـە یەکەمیـن جار بە چاوبەستراییەوە بردیانـە بـەردەم ڕائیـد سـەلمان، دوو ڕۆژ بـوو شـل و کوتیـان کردبـوو، بـە نیـوە مردوویـی فڕێیاندایـە بـەردەم ئـەو و پێیـان گـوت:

- سـەیدی، هێشـتە ئـەو خوێڕییـە بەرگـری دەکات و دان بـە هیـچ تاوانێکیـدا نانێـت.

ئەویش هێندەی دیکە هار و شێت بوو، خوێن لە هەموو گیانی گەڕا، ڕك و تووڕەیی لە دەم و چاویدا دەباری، ئەو جەستە قورسەی دوو هێندەی خۆی بەوەج بوو، کونە لووتەکانی هەناسەی تووڕەییان دەردەدا، بە چاو و برۆ و جەستە و دەمەشڕەکەیەوە وەك یاریکەرێکی بەهێزی زۆرانبازی، میناك ئەوەی لەسەر شانۆی زۆرانبازییە سەختەکاندا بێت، ئەو زۆرانبازییانەی، کە پاڵەوانە هار و هاجەکان، دەبێت یەکێك ئەوەی دیکە لەناو ببات، ئاوا وەك دوا لێدانی زۆرانبازییەکە، نەڕاندی و دەستی بۆ ملی ئومێد برد و بەرزی کردەوە و فڕێیدایەوە سەر زەوی.

دە خولەکان بوو بە دیار ئومێدەوە چرووتی دەکێشا، دووکەڵی ئازاردانی دڵیان خۆش دەکرد، هێشتاکەش کۆڵی دڵی لێی دانەمرکابوو، وەلێ ئەو ڕۆژە بۆ ئەو هێندە بەس بوو، کە پێی ڕاگەیاند و بە هەڕەشەوە پێی وت:

- دەبێت بەو سەرمای زستانە تاوەکوو بەیانی بە ڕووتی لەبەر باراندا لە سەریان بتبەستنەوە، ئەوسا ئەگەر دەربازبوویت و نەمردیت، تاکە ڕێگەت ئەومیە، کە دەبێت دان بە کوشتنی چیاد دا بنێیت، یاخۆ وەك سەگ دەتۆپێنم و ڕزگارمان دەبێت لە دەستت، ئەگەر ئەقڵیشت بەکارهێنا و خۆت دانبنێی، ئەوا وات بۆ دەنووسین، کە حاکمیش یارمەتیت بدات.

ئومێد دەیزانی و زۆری بیستبوو، کە ئەو ئەمنانە بە فێڵ لە

گیراوان دەچنە پێشێ و بە قسەی خۆش بەڵێنییان دەدەنێ، بەڵام دوای دانپیانان، هەموو شتێك تەواو دەبێت، ئیتر ئەو کەسە بە دەستی خۆی پەتەکە دەخاتە ملی خۆی و تازە کەس ناتوانێت بە هانایەوە بێت، بۆیە ئەویش بەرگەی گرت.

شەو بە ڕووتی بردیانە سەربان و بەستیانەوە و ڕادەستی چارەنووسێکی نادیارییان کرد.

کە بەیانی بووەوە، چاوەکانی کردەوە هێشتاکە بە ڕووتی هەر لە سەربان بوو، ئەو شەوە تا بەیانی باران و سەرما جەستەیان خاپوور کردبوو، تەماشای دەست و قاچەکانی خۆی کرد، نەیتوانی هیچ بکات، جووڵەی نەمابوو وەك جەستەیەکی بێ گیان هەر هێندەی دەزانی و هەستی بە خۆی دەکرد، کە هێشتاکە لە ژیاندایە و دڵی لێدەدا و بەرگەی ئەو هەموو سەرما و بارانی ئەو شەوەی گرتووە، ئەوسا زانی کە ئەو شەوە گیانی لە جێگەیەکی سەخت بووە و دەرنەهاتووە.

سەرەتای کاتەکانی بەستنەوەی لە سەربان هەستی بە سەرمایەکی زۆر دەکرد، کە گیانی داگیرکردبوو، تەماشای خۆی دەکرد نەیدەتوانی دەمی دابخات، بگرە هەستی بە قرچە قرچی ددانەکانی دەکرد، کە لەم کشوماتی سەربانەدا، بەدەم بای ساردەوە بەر گوێی دەکەوت و هەستی پێدەکرد، لەبنی پێیەوە تا تەوقی

سەری هەڵبەز و دابەزی بوو، وایدەزانی سەرمای ئەم زستانە و ئەم شەوە هەمووی لە جەستەی ئەودا کۆبووەتەوە.
نەیدەتوانی دەست و قاچەکانی لێکبخشێنێ و خۆی گەرم بکاتەوە، چونکە دەست و قاچەکانی بەسترابوونەوە، لە ناو ئازار و ژاندا تزی بە دەمی هاواری دەکرد، بەڵام هاوار و ناڵەی بێ سوود بوو، چونکە هەر دار و دیوار گوێیان لێی ڕادەگرت، دەنا ئەگەر بشگەیشتبایە کارمەند و دەرگەوان و پاسەوانانی دائیرەی ئەمنیش، خۆیان لێی نەبان دەکرد، چونکە ئەم ئازاردانە و ئەم جەنگە دەروونییە لە دژی ئەو دەیانکرد، جا کێ دەیتوانی قسە لە قسەی رائید سەلمان بکات، ئەوە نەبێت، کە هاوار و ناڵە و ئەشکەنجەی لە ڤالآیی ئاسماندا زووتر دەگەیشتە لای خوا و هەر خواش دەیزانی چارەنووسی نادیاری بە کوێ دەگات!
بەیانییەکی درەنگ دنیا ڕووناک بووەوە، ئەو هێشتە پێڵوی چاوەکانی نەدەترووکان، نەیدەتوانی چاوەکانی تەواو لێك بکاتەوە و بزانێت چ کاتە، بەڵام بەوەی هەستی دەکرد تاریکی شەو نەماوە و تۆزقاڵێك چاوەکانی لە نێوان تاریکی شەو و ڕووناکی ڕۆژەکەی لێك جیا دەکردەوە، زانی شەو کۆتایی هاتووە، ئەو شەوە سەختەی تێپەڕاندووە و گیانی لە جێگەیەکی تووند بووە و هەڵنەقەناوە و ماوە، بەڵام نەیدەتوانی چاوەکانی هەڵبێنێ، دواییش وردە

وردە تەکانی دایە هزر و مێشکی خۆی و چەند جارێك چاوەکانی خۆی کردەوە و دایخستەوە، ئەوجا توانی تۆزێك زیاتر هەست بە هاتنی ڕۆژەکە بکات و بزانێت ئەو شەوەی بە چ ئازارێکەوە تێپەڕاندووە، ئەوسا بڕوای بەوە هێنا هێشتاکە خوای گەورە پێنووسی لە سڕینەوەی نەداوە، ئینجا شایەدمانێکی بە هەقی هێنا، لە دڵی خۆیدا بڕیاری دا بەرگە بگرێ و خۆی نەکاتە بکوژی چیاد، ئەگەرچی دەشیزانی ئەو ڕۆژانەی، کە دێن هێشتاکە ڕەنگە لەم شەوەی ئەو تێیدا بەسەری برد سەختتر و دژوارتر و ترسناکتر بێت.

بەرگەگرتنی ئەم هەموو ئازار و لێدان و جەنگە دەروونییەی، کە لەگەڵیدا کرابوو، پێشبینی خراتریشی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەش مردنی خۆی پێ لەسەر هەقتر بوو، لەوەی دان بە شتێکدا بنێت، کە نەیکردبێت و لە هەموو دۆخێکیشدا بۆ ئەو هەر نەمان بوو و مردنێك قەرزاری بوون بوو.

ئەمجارە دەرفەت بوو بۆ دائیرەی ئەمن، تاوەکوو بە هۆیەوە سێدارەی بۆ مسۆگەر بکەن و لە کۆڵیان بێتەوە، بەڵام هەرچەندی لێیان دا و ئازاریان دا و کارەبایان لە هەموو گیانی دا، ئەو هەر خۆی ڕاگرت، ئەگەرچی پێشتر بە هۆی لێدانی کارەباوە پیاوەتی لە دەستدابوو، ئەمجارەش هەموو گیانیان کردبوو بە برین و شوێنی

جگەرە بە هەموو جەستەیەوە دیار بوو، لە ئەشکەنجەدا سێ نینۆکی دەست و دوو نینۆکی پێیەکانیشیان دەرهێنا، بەڵام ئەو هەر بەرگەی گرت و دانی بە هیچ شتێکدا نەنا.

ئەوان دەیانویست بەڵگەیەکی کوشتنی چیاد لە زاری خۆیەوە تۆمار بکەن و بەو هۆیەوە دادوەری دادگەی شۆڕش دانپێدانەکە بکەن بە بڕیارێك، بۆ لە سێدارەدانی ئومێد، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کەسێکی وەرەبەرز بوو و خۆیشی تاوانەکەی نەکردبوو، بۆیە بەرگەی هەموو ئەم ئازارانەی دەگرت، کە فەلاقەیان دەکرد و لێیان دەدا و بە پانکە هەڵیان دەواسی و کارەبایان لێ دەدا، بە هەموو هۆکارێك لە جەنگی دەروونی بوون لە دژیدا، کەچی ئومێد هەر مکوڕ بوو، کە ئەو چیادی نەکوشتووە و خۆی بکوژی خۆی بووە، ئەو کاتەش کە بۆ کوشتنی هاتووە چیاد لەژێر گوشارێکی دەروونی سەختدا بووە، بۆیە لەجیاتی ئەو بکوژێت، کە بۆ ئەوەش هاتبوو ئەو خۆی بوو بە قوربانییەکە و لە بکوژەوە بوو بە کوژراو و قوربانی.

ئەوان پێیان سەیر بوو، کە چۆن پیاوی خۆیان لەناو ئەو هەموو ناز و نیعمەتی حکوومەتدا بوێری ئەوەی هەبێت ناپاکی لە حیزب و شۆڕشی ١٧- ٣٠ی تەمووزی پیرۆز و سەرۆکی فەرماندە بکات، کە بۆ پیاوانی خۆیان لە باوکێك زیاتر بوو، بەتایبەتی هێزی ئەمن، کە ئەگەر

ڕاستیش بێت بڕوایان بەمە نەدەکرد، کەسێك لەو هەموو خۆشگوزەرانییە هەڵگەڕێتەوە و خۆی پێلەقە لە بەختی خۆی بدات.

ئەوان لە ئومێد زۆر ڕق ئەستوور بوون، بۆیە لە گرتووەکانی دیکە زیاتر لەویان دەدا، بە چاوی دوژمن سەیریان دەکرد، بەردەوامیش ئەو قسانەی لە گوێیدا دەزرنگایەوە، کە لە کاتی فەلاقە و لێدان و ئەشکەنجەدا بە ڕقێکی ئەستوورەوە و بە تەوسەوە بەدەم ئەم لێدانە سەختەدا، بەتایبەتی ئەو ئەشکەنجەدانە سەختەی، کە دوای هەموو جۆرە بەکارهێنانی هۆیەکانی ئەشکەنجەدان، دواجار خۆشیان ماندووبوون و پێیان وت:

- أبن الخره أعترف وخلصنا وخلص نفسك من ها العذاب وقل لنا أنت شلون قتلت مفوض چیاد؟

واتە: کوڕی گو دانی پێدابنێ و ئەم ئیشەمان لە کۆڵ بکەوە، خۆشت دەرباز بکە، لەم ئازارە و پێمان بڵێ: تۆ چۆن مفەوەز چیادت کوشت؟

- سیدی، والله العظیم أنا ما قتلته، حتی عدنا أسمه مو چیاد.

واتە: گەورەم، بە خوای گەورە من نەمکوشتووە، تەنانەت لای ئێمە ناویشی چیاد نەبوو.

- لعد شنو أسمه؟

واتە: کەواتە ناوی چی بوو؟

- عرف نفسه عدنا نحن بائعي الكتب بغير أسم.
واتە: لای ئێمەی کتێبفرۆش بە ناوێکی دیکە خۆی ناساندبوو.
- شنو الأسم، وشلون عرف نفسه عندكم؟
واتە: ناوەکە چی بوو، چۆن خۆی لای ئێوە ناساندبوو؟
- عرف نفسه بمفوض العسكري وقال لنا بأنه أسمه عباس السلطاني.
واتە: خۆی بە مفەوەزی سەربازی ناساندبوو و بە ئێمەی وت ناوی عەباس ئەلسوڵتانییە.
- شنو الفرق عباس أو چياد، هسه قل لنا أنت شلون قتلت عباس أو چياد ماكو فرق؟
واتە: جیاوازی چییە لە نێوان عەباس و چیاد، ئێستە پێمان بڵێ تۆ چۆن عەباس، یان چیادت کوشت، جیاوازی نییە.
- سيدي، والله العظيم أنا ما قتلته، صح هو جاي يقتلني، لكن عذب ضميره و أخيرا، الأدب غير نفسيته من أنسان شراني الى أنسان صاحب ضمير وحقاني وعاطفي يحب الأنسان ويحيز للحق، لهذا بدل مايقتلني قتل نفسه، بدل ما خلصني من ها الدنيا هو أختار لنفسه بترك الدنيا والحياة.
واتە: گەورەم بە خوای مەزن من نەمکوشتووە، ڕاستە ئەو هات من بکوژێت، بەڵام ویژدانی ئازاری دا و دواجار ئەدەب ناخی ئەو پیاوەی گۆڕی و لە مرۆڤێکی شەڕانگێزەوە کردی بە مرۆڤێکی خاوەن ویژدان و حەقپەرست و سۆزدار

و مرۆڤ ویست و پابەند بە هەق، لەبەرئەوە لەجیاتی ئەوەی من بکوژێت، خۆی کوشت، لەجیاتی ئەوەی من لە دنیادا بسڕێتەوە، ئەو خۆی بەجێهێشتنی ژیان و دنیای بۆ خۆی هەڵبژارد.

- أبن الكلب، أبن القندرة، أنت تكذب، قل لنا أنت ويا أي مجموعة من المخربين جماعة مسعود أو جلال أو عزيز محمد؟

واتە: کوڕی سەی، کوڕی پێڵاو، تۆ درۆ دەکەیت، پێمان بڵێ: تۆ لەگەڵ کامە گرووپ لە تێکدەرانی، گرووپی مەسعود، یان جەلال، یان عەزیز محەمەد؟

- أنا فقط شاعر وبائع كتب، كاسب وعلى باب الله، ما عندي علاقة مع أي حزب.

واتە: من تەنیا شاعیرێکم و کتێبفرۆشم، کاسبم و رزقم لەسەر خودایە، هیچ پێوەندییەکم لەگەڵ هیچ حیزبێکدا نییە.

لەگەڵ ئەم وەڵامانەش کە بە دڵی ئەوان نەبوو، ئەوان زیاتر لێیان دەدا، لەگەڵ لێدانیشدا یەکێکیان بە تووڕەییەوە پێی وت:

- كواد أنت تغشم نفسك لو عبالك أحنا غشيم، ويا من تشتغل أذا مو مع مسعود أو جلال أو عزيز معناته أنت تشتغل مع نوشيروان، أنت تنظيم جماعة كوملە؟

واتە: گەواد، تۆ خۆت یاغنیش دەکەیت، یان وا دەزانی

ئێمە یاغنیشین، تۆ لەگەڵ کێدا کار دەکەیت، ئەگەر لەگەڵ مەسعود و جەلال و عەزیز نەبیت، واتە تۆ لەگەڵ نەوشیرواندا کاردەکەیت، تۆ لە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی؟

پێدەچوو یەکێکیان کە قسەکانی ئاڕاستەی دوو کەسی دیکە دەکرد ئەفسەرییان بێت، چونکە دوو کەسەکەی دیکە یەکێکیان ڕووی لەو کرد و وتی:

- سیدي هاي گواد يكذب علينا، هاي عنده سابقه عدنا، أكو عنده ملف عدنا، كان ضيف عدنا سابقا ولاگين ببيته أثناء التحري كتاب (رأس المال) لهذا الكافر (ماركس) وكتاب (أين الله؟)، هذا هم كافر يدور عن الله، خلي نشوفه الله لهذا التلميذ ماله.

واتە: گەورەم، ئەو گەوادە درۆمان لەگەڵدا دەکات، ئەو پێشتر لای ئێمە بووە، فایلی لای ئێمە هەیە و پێشتر مێوانمان بووە و لە کاتی پشکنیندا لە ماڵەکەیدا کتێبی (سەرمایە)ی (مارکس)ی گاور و کتێبی (کوانێ خوا؟)ی گاورێکی دیکەی لێگیراوە، ئەوش هەر گاورە و بە دوای خوادا دەگەڕێت، دەبا خوای پیشان بدەین بۆ ئەو قوتابییەی ئەوان.

- يالله يابه شوفه، حتى بعد مايدور عن الله.

واتە: دەی پیشانی بدەن، تا چی دیکە بە دوای خوادا نەگەڕێت.

کە ئەفسەرەکە وای پێگوتن ئەوان زیاتریان لێ دا، بەدەم لێدانیشدا پێیان دەوت:

- ها.. تشوف الله؟ يشوفك الله، لعد ليش ما يجاوب عليك.

واتە: ها .. خوا دەبینیت؟ خوا دەتبینێت، ئەدی بۆچی لەسەرت بە جواب نییە؟

ئەویش لەتاو ئازارەکانی گیانی و ژان و داهێزرانی جەستەی لەگەڵ هەر لێدانی قامچی و بۆڕییەك هاواری خوای دەکرد:

- خاتر الله عوفوني والله العظيم أنا مو قاتل هو قتل نفسه.

واتە: بۆ خاتری خوا وازم لێبێنن، بە خوای مەزن من بکوژ نیم، ئەو خۆی بکوژی خۆیەتی.

- خره بالله أحنا مانشوف الله وين أكو الله هنا أنت تشوفه؟

واتە: گو بە خوا، ئێمە هیچ خوایەك نابینین، کوا لێرە خوا هەیە، تۆ دەیبینیت؟

- الله بالسماء كلنا نعبده وكلنا مسلمين .. أنتم ما تخافون من الله؟

واتە: خوا لە ئاسمانە، هەموومان دەیپەرستین و هەموومان موسڵمانین، ئێوە لە خوا ناترسن؟

- أحنا بس نخاف من سيد الرئيس، الله يحفظه و يرعاه، الله داز النا بالسماء صار وكيله بالأرض، بعد لاتكول

خاطـر اللـه، گل خاطـر سـيد الرئيـس صـدام حسـين اللـه يحفظـه ويرعـاه.
واتـه: ئێمـه تەنيـا لـه سـەرۆكـی فەرمانـده دەترسـين، خـوا بيپارێزێـت و بيخاتـه ژێـر چەتـری خـۆی، خـوا لـه ئاسـمانەوه بـۆ ئێمـەی نـاردووه و بوومتـه جێگـرەوەی ئـەو لەسـەر زەمیـن، چـی دی پێمـان مەڵـێ: لەبـەر خاتـری خـوا، بڵـێ: لەبـەر خاتـری سـەرۆكـی فەرمانـده سـەدام حوسـێن، خـوا بيپارێزێـت و بيخاتـه ژێـر چەتـری خـۆی.
ئومێـد نەيدەويسـت بـه هـۆی سـەرۆكـی فەرمانـدەوه لێـی خـۆش بـن، چونكـه دەيزانـی ئەگـەر نـاوی ئەويـش بێنێـت و بـۆ خاتـری ئـەو وازی لێبێنـن، دەيزانـی ئيـدی ئـەوان هـەر وازی لێناهێنـن و پێـی دەڵێن: سـەرۆكـی فەرمانـده لـه بكـوژی متمانەپێكـراوی خـۆی خـۆش نابێـت.
ئەويـش زياتـر هێـز و بەرگـری دەدايـه بـەر گيانـی خـۆی و دەيزانـی تاكـه چارسـەری كێشـەی ئـەو هـەر تەنيـا و تەنيـا دان بەخۆدانانـه، ئيتـر دەبـێ بەرگـەی ئـەو هەمـوو ئازارانـه بگرێـت و خۆڕاگربێـت، دەنـا هيـچ ڕێگەيەكـی ديكـه دەربـازی نەدەكـرد.

* * *

(٦)

هێشتا لە سەربان بوو، بیری خۆکوشتن و خۆفڕێدان لە سەربانەوە وازی لێنەهێنابوو، بەڵام جارێ نەگەیشتبووە دۆخی کۆتایی و ئەو داوە باریکەی کە لەگەڵ ژیاندا مابووی بیپسێنێت و پێوەندیی بە تەواوەتی دەگەڵ بووندا بپچڕێنێت.

جارێ بیر و هۆشی دەیگەڕاندەوە ڕۆژانی ڕابردوو، ئەو ڕۆژگارە دیار و بەرچاوانەی کە بۆ ئەو خاڵی بەهێز و وەرچەرخان بوون، نەیدەتوانی لە بیر و هۆشی خۆیدا دەریانبێنێت، هەرچەندی بیری خۆی دەگوشی و خۆی بەم چرکەساتانەوە مژوول دەکرد، کە ئەو هزر و خەیاڵانەی لە مێشکی خۆیدا پەردەپۆش بکات و بەجێیان بهێڵێت، تەواو لەوە دڵنیا بێت، ئیتر مانەوەی ئەو لەم ژیانەدا نابێت بەردەوام بێت، ئیدی ئەو دوای خاتوون کێی هەیە بۆی بژیت.

ئەوەی ئەو لە ژیاندا دۆزییەوە و دڵی پێی خۆش بوو،

لەنـاو ئـەو هەمـوو كوێرەرێیانـەدا، لەنـاو هەمـوو ئـەو گرتـن و ئەشـكەنجە و سـەختییەی ژیانیـدا، تەنیـا بـە ئەنجـام گەیشـتنی ئـەم عیشـقەی بـوو، كـە لەگـەڵ خاتوونـدا ماڵێكـی خۆشەویسـتی كۆیكردنـەوە، ئیتـر وا ئەویـش نەمـا و ئـەو كانییـە كوێـر بـوو، كـە پێكـەوە ئـاوی عیشـقییان لێـی دەخـواردەوە، ئیتـر بـەری ڕەنجـی ئـەم عیشـقەش وا كاڵ بـووەوە و خاتـوون لەسـەر ڕێـی ئـەو عیشـقە وەدەری نـاو دڵـی خـۆی بـۆ گەنجێـك كـردەوە، كـە وەك كـوڕی ئـەوە بـوو.

وا خۆشـەویستی ئومێدی لـە دڵـدا دەرهێنـا و بۆ یەكێكـی دیكـەی كـردە كوانـووی دڵـداری و توانـی هەمـوو ئـەو ڕۆژانـەی ڕابـردوو لەگـەڵ ئـەودا بسـڕێتەوە و ژیانێكـی نوێ بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە، كەچـی بیـری لـەوە نەكـردەوە، كـە بـۆ ئومێـد سـەختە دەسـتبەرداری هەمـوو ئـەو ڕۆژانـە بێـت و واز لـەو هەمـوو یادەوەرییـە جوانانـە بێنێـت، كـە لەگـەڵ ئـەودا دروسـت بووبـوون، ئاخـر ئەگـەر سـڕینەوەی ئـەم ڕابـردووە بـۆ خاتـوون ئاسـان بێـت و بكارێـت دەسـتبەرداری بێـت و ئومێدیشـی خسـتە گێژاوێكـەوە، مەگـەر بـە مـردن لـە مێشـك و بیـر و هزرانیـدا بسـڕێتەوە. ئـەوە نییـە وا بـەدەم بیرهاتنـەوە و دەسـتبەردار نەبـوون و فڕێدانـی ئـەم ڕابـردووە وازهێنـان لـەم عیشـقەی خاتـوون لـە پەلوپـۆی خسـتووە و جارێكـی دیكـە ناتوانێـت بژێـت و بتوانێـت

لاپەڕمیەکی دیکە لە ژیاندا بکاتەوە، کە خاتوونی تێدا نەبێت و ناتوانێت چیتر ژیانێکی دیکە بژی، کە هەردەم عیشقی ئەوی لە دڵدا چەقی بێت و بە خستنە دەرەوەی ئەم عیشقەش بەردەوامی ژیان لای ئەو ئەستەمە، بۆیە دوای ئەم زەبرەی خاتوون لێی دا، دوای ئەو درزەی، کە خستییە نێوان ژیانی هەردووکیان، دوای جێهێشتنی ئومێد بە تەنیا، ئیتر ئەو ناتوانێت بێ ئەو چی دیکە هەناسە بدات و بژی، کە هەموو ڕوانینەکانی وێنەی خاتوونی بێنێتەوە پێش چاو.

ئەگەر بتوانێت هەرچەندە سەختیشە بێ ئەو بژی، بەڵام ئەو یادەوەرییانە، ئەو ڕۆژە جوانانەی ڕابردووی لەگەڵ خاتوون، هەر هەمان ئەو ڕۆژانەن، کە لە ژیاندا بوو، بەڵام لە زیندان و گرتووخانەدا بوو، ئیتر بێ خاتوون ژیانی داهاتووی لەو زیندانانەش سەختترە، کە تیایدا بووە و ڕۆژانی تەمەنی لێی وەریوە، بگرە هەر چرکەیەکی بۆ ئەو مردنێکە، بۆیە ئەوەی لە مێشکی خۆیدا ساخ کردبووەوە، کە ئیدی دوای خاتوون بۆ ئەو ژیان هیچ خۆشی و هەناسەدانی تێدا نەماوە.

ئەو لە مێشکی خۆیدا ساخی کردبووەوە، کە لێرە بە دواوە دوای خاتوون بۆ ئەو واتە ژیان ستەمە.

*   *   *

هێشتاکە یادەوەرییەکانی وازیان لێ نەدەهێنا و نەیاندەهێشت ئەو داوە مووەی لەگەڵ ژیاندا ماویەتی بیپچڕێنێت، بۆیە هێشتە نەیتوانیبوو بیرکەوتنەوەی ڕۆژانی ڕابردوو لە مێشکی خۆیدا بوەستێنێت.

هەر کاتێك توانی بیرهاتنەوەی ڕابردوو، لە مێشکیدا بوەستێنێت، ئەوا بێگومان دەگاتە ئەو چرکەساتەی کۆتایی، ئەو کاتەش خۆی لە سەربانی ماڵی خوشکەکەی فڕێ دەدات، کە هەر بۆ ئەو مەبەستەش هاتۆووەتە سەربان، تاوەکوو پێوەندیی یەکجاری لەگەڵ دنیادا بپسێنێت و چی دی بەم شێوەیە خاتوون نەبینێت، بەڵام بیرکەوتنەوەی ئەم یادەوەرییانە ناتوانرێت بوەستێنرێت، تەنیا ئەو کاتە دەبێت کە ڕۆحی لە جەستەی جیاببێتەوە، ئەو کاتە ئەو ڕابردووەش لە مێشکیدا لە جووڵە دەکەون و کۆتاییان بە بیرهاتنەوەی دێت.

هێشتاکە نەیدەتوانی بیرهاتنەوەی ئەم یادەوەرییانە لە مێشکیدا بوەستێنێت، ئەمجارە ئەو ڕۆژانەی هاتەوە بیر، کە هەستی بەوە کرد هێشتاکە پێوەندیی بە دنیاوە ماوە.

بەیانییەك لە دنیایەکی تاریکەوە هاتە ناو دنیایەکی دیکە، کە چاوەکانی ڕووناکی دەرەوەی ژوورە تاریکەکان ببینێت، ئیتر بەو بەیانییە ئەو و دوو

زیندانی دیکەیان، کە دوویان پێکەوە، ئەویشیان بە تەنیا بەستنەوە و سواری ئۆتۆمبیلێکی لاندکرۆزیان کردن، بە چاوی کراوەوە دوا ماڵئاواییان لە هەولێر کرد و بەرەو بەغدا کەوتنەڕێ.
کاتێك جار جارە لە ئاوێنەی ئۆتۆمبێلەکەدا سەیری خۆی و گیراوەکانی دیکەی دەکرد، وەك مرۆڤی نیاندرتاڵ خۆیان بینی، کە تازە هاتبنە دنیا و نەزانن سەر و ڕیش تاشین چییە، یاخۆ ڕاستتر خۆی و دوو کەسەکەی دیکەی وەك سێ لە یارانی ئەشکەوت بینی، کە دوای ئەو هەموو ساڵە، لە سەردەمێکی دیکە لە خەو ڕابووبن و دەگەڵ مرۆڤی ئەو سەردەمی زۆریان جیاواز بێت.
کە سەیری ڕووخساری خۆی و هاوڕێکانی دەکرد، خۆیانی بە ڕەنگ زەرد دەبینی، وەك ئەوەی نەخۆشی سەختیان گرتبێت و لە سەرەمەرگدا بن، هێندە بوو هێشتا هەناسەیان دەدا و دڵیان لێی دەدا و خوێنیان لە جەستەیدا دەجووڵایەوە.
کە زۆریش زەینی دەدا خۆی و برادەرانی گیراوی، وەك مرۆڤی هەسارەیەکی دیکە خۆیان دەهاتە پێش چاو.
بە درێژایی ڕێگە بیری لەوە دەکردەوە، کە ئیتر ئەوە بەرەو چارەنووسێکی نادیارییان دەبەن و نازانن جارێکی دیکە تەمەنێکی دیکەیان پێدەبەخشن، یاخۆ بەرەو

مەرگ ڕاياندەپێچن، خۆ ئەگەر بشمێنێن، دەبێت بە گوێرەی میزاجی حاکمی دادگە، کە بەرەو ئەوێیان دەبەن، ئەو ژیان و مانەوەیان، یانیش مەرگیان بۆ دیار دەکات، بەڵام لەگەڵ ئەمەش دڵیان لەو کاتانەی زیندانی ئەمنی هەولێر خۆشتر بوو، هەر هیچ نەبێت تاوەکوو ڕۆژی دادگە، بە درێژایی ئەو ڕێگە دوورە، گاڤێکی دیکە دوای ئەو هەموو کاتەی ڕۆژیان لێ ون بوو، وا ئەمجارە ڕووناکی و تیشکی ڕۆژیان بەرکەوتەوە. بە درێژایی ڕێگە چاویان بە شەقام و شۆستە و خانوو و دووکان و بازاڕ و دەشت و دەر و کۆلان و چیا و گرد و ئەو فەزا کراوە دەکەوت، چاویان لە بینینی هیچ شتێك تێر نەدەبوو، بە تایبەتی ڕەوە چۆلەکە و مەل و ڕیشۆلە و کۆتر و تیترواسك و تەیر و تواڵێکی لە ڕێگەدا بەرچاویان دەکەوت.

ئاخر ئەو کە ئەو دیمەنانەی دەبینی، هەستی بە خۆشییەکی دیکە دەکرد، کە جارێکی دیکە چاوەکانی زەوی و ئاسمان تەی دەکەن، ئەو کاتانەی دەهاتەوە بیر، کە لە زیندانی ئەمنی هەولێر تەنیا جار جارە، لە درزێکی هەوا کێشەکەی ڕێڕەوەکەدا، کە بەسەر دەرەوەدا دەیڕوانی، ئەو بستە ئاسمانەی دەدی و دڵی پێی خۆش بوو، هیوایەکی مان و هەناسەدانی پێدەبەخشی، ئێستێ وا چاوەکانی کراوەن و هەموو

ئەرز و ئاسمان دەبینێت، گوراحی خۆشدەکەن، تا ڕادەیەکیش هیوایەکی مانی پێدەبەخشن.
ئەوەی بەندی نەکرابێت، نازانێت تامی هەناسەدانێکی ئازاد چەند خۆشە، بینینی ئاسمانێکی کراوە و بێ چاودێری چەند جوانە، نازانێت تامی سەربەستی چەند خۆشە، نازانێت جوانییەکانی دنیا چییە، بۆیە زیندانی هیوای جارێکی دیکە بینینەوەی شەقام و شۆستە و ئاسمان و دارو بەرد و چیاو دۆڵ و دەشت و گرد و هەموو بوونێکی ژیانی هەیە. ئاواتەخوازی هەموو چرکەیەکی ژیانە بە خۆشی و ناخۆشییەوە، ئاواتی ئەوەیەتی کەسێك ڕێگری نەبێت لە شەقامەکانی شارەکەیدا پیاسە بکات و تێیدا بسووڕێتەوە، سبەینان و ئێواران لە ماڵەوە و بازاڕدا شنەبایەکی فێنکی وڵاتەکەی تژی بە سییەکانی هەڵمژێت، بە ڕووتی لەبەر بارانی لەزمتدا سەما بکات و باران سەر و قژی تەڕ بکات.
ئەگەر مرۆڤ هیچیشی لە گیرفاندا نەبێت و ڕووت و ڕەجاڵیش بێت باکی پێ نییە، گرینگ ئەوەیە ئازاد و سەربەست بێت.
وەك مەلێك کە ماوەیەکی زۆر لەناو قەفەز بێت، لەناکاو دەرگەی بۆ بکرێتەوە و باوەش بە ئاسماندا بکات، هێندە ئەودالی بینینی دەرەوە بوو، هێندە

چاوەکانی لە سەرنجدانی بڵند و نەویاتیاندا تێر نەدەبوو.
هێندەی لەناو ژوورە تاریکەکاندا بوو، چاوەکانی بەرانبەر ڕووناکی خۆر هەڵنەدەهات، لەگەڵ ئەوش هەردەم بۆ ئاسۆیەکی دوور هەتەریان دەکرد.
ئەو هێشتە لە ڕزگار و توانا باشتر بوو، ئەوان هەتا گەیشتبوونە خورماتووش، هێشتا نەیاندەتوانی چاوەکانیان بکەنەوە و سەیری دەرەوە بکەن، بەڵام هیوایەکیان لە دڵدا مابوو، کە ئەگەر لە دادگەدا، لە پەتی سێدارە ڕزگاریان بوو، ئەوا لە گرتووخانەشدا بێت خەونی بەربوون و ڕزگاربوون دەبینن و ئاواتی بەردەوامی ژیان دەخوازن.
ئومێد کە لە دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکەی دەڕوانی و تەماشای جووڵەی مرۆڤەکانی دەکرد و لەو سروشتە ڕادەما و لە ئاسمان ورد دەبووەوە خۆزگەی بەو کەسانە دەخواست، کە لە شارۆکەکان و لە ڕێگەدا ناوە ناوە جووتیارانی دەبینی، یان ئەو ئۆتۆمبێلانەی تێدەپەڕین و بەرانبەریان دەهاتن، بە کورتی بەخیلی بە هەموو مرۆڤ و گیانلەبەر و بێ گیانەکانیش دەبرد، خۆزگەی دەخواست وەك ئەو کەسانە ئازادبووایە و کەلەپچەی لە دەستەکانیدا نەبینێ و وەك ئەو خەڵکەی دەیانبینێت، کەس لێپێچینەوەی لەگەڵدا نەکات و بە سەربەستی

بێت و بچێت، وەك ئێستەی نەبێت، كە هێشتاكە نازانێت چارەنووسی لە دادگەی بەعسدا بەچی دەگات، بۆیە لە دڵی خۆیدا ڕووی لە خوای گەورە بوو و دەیگوت: (خوایە گیان بۆچی ئێمەت بۆ ژێردەستەیی چێ كرد، چی دەبوو میللەتی منیش وەك هەموو میللەتانی دنیا ئازاد بووایە و مرۆڤەكانی لەجیاتی زیندان و تێهەڵدان و كوشتن و قڕكردن و ئەنفالكردن و كیمیاباران و چەوساندنەوەی نەتەوەیی، خەریكی ژیانی خۆیان بووان و لە نەتەوە یەكگرتووەكاندا خاوەن وڵات و ئاڵای خۆی بووایە و خەڵكانی بە ئازادی و سەربەستی و ئاسوودەیی بژیابووان)

ئومێد ئەگەرچی نەیدەزانی لە دادگەدا مردنی بۆ دیاری دەكرێت، یان جارێكی دیكە ژیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەبەرئەوەی چاوەكانی كرابوونەوە و دەیتوانی هەوای دەرەوەی تەلبەندەكان هەڵمژێت و چاوەكانی خەڵك و شتەكان ببینێت، حەزی دەكرد ئەو ڕێگەیە نەبڕێتەوە و تەواو نەبێت، هیچ نەبێت ئەو كاتانەی لە دەرەوەی زیندانن، دڵی بە هەوایەكی جیاواز و بینینی جیاواز و بیستنی جیاواز لەوانەی كە لە زیندان بوون خۆش دەبێت.

وای بیردەكردەوە، كە ئەوانەی لە دەرەوەی تەلبەندەكانن، چەندە مرۆڤی بەختەوەرن، چونكە

مـرۆڤ تـا لەنـاو ژووره تەنگەبـەرەکان و سـیخناخ بـە خەڵـك نەبیـت و نەکەویتـە پشـت دەرگـە ئاسـنەکان و نەیخەنـە پشـت تەلبەندەکانـی گرتووخانـەکان نازانێـت، ئەوانـەی لـە دەرەوەن چەنـد بەختـەوەرن، نازانـن هەڵمژینـی هـەوای ئـازادی چ تامێکـی جیـاواز و خۆشـی هەیە، نازانـن ئازادبـوون چەنـد خۆشـە، ئەو دەمانـەی مـرۆڤ دەکەوێتـە پشـت تەلبەنـدە سـەختەکانەوە بەخیلـی بـە هەمـوو بوونەوەرێکـی دەرەوەی زینـدان دەبـات، خۆزگـە بـە بچووکتریـن باڵنـدەش دەبات، کـە لـە دەرەوەی زینـدان بـە ئـازادی دەفڕێـت، خۆزگـە بـە هەمـوو ئاژەڵێـك دەبـات، کـە لەباتـی ئێسـتەی مرۆڤبوونـی بووبـا.

ئەو ڕۆژە ئومێد بە دوو چاوی خۆی و دوو چاوی دیکـەی پڕ لـە هەسـتەکانییەوە، لـە دەرەوەی نـاو ئۆتۆمبێلـی دەڕوانـی، لـە شـەقام و شۆسـتە و ماشـێنە هاتـوو و گەڕاوەکانـی ڕێگـەی بەغـدای دەڕوانـی، لە دەشـت و خانـوو و دووکان و سـەوزایی و مەزارگـە و مزگـەوت و عەرەبانـە و کـوخ و جووتیـار، ئـەو کەسـانەی کـە لـە ڕێگـە دەیبینیـن، ئەگەرچـی زسـتان بـوو، بـەڵام لـە خۆشـی بینینـی دەرەوە، هەسـتی بـە سـەرما نەدەکـرد، ئـەو سـاردییەی زۆر لـە ژووره شـێدار و بـۆن میـز و جەنجاڵەکانـی نـاو زیندانـی ئەمنـی هەولێری پێـی خۆشـتر بـوو، کە لەوێنـدەر هەسـتی دەکـرد ژیـان لـە جووڵـە کەوتبێـت.

بە درێژایی ڕێگەی بەغدا تاوەکوو هێزی تێدابوو، هەناسەی قووڵی هەڵدەمژی و هەستی بە بۆنی خۆشی هەموو ڕێگە و بەرزایی و گردۆڵکە و چیا دوورەکانی دەکرد، تەڕی ریگاکەش پشووی درێژتر دەکرد و جوانییەکی دیکەی پێدەبەخشی، چەندی دەکرد لە بۆن و بینینی ئەم دنیاکراوەی دوای چاو کرانەوە و هاتنە دەرەوەی زیندانی تێر نەدەبوو.

کە گەیشتنە بەغداش هێشتا لە سەیرکردنی شەقام و تەلار و بازاڕ و جەنجاڵی شارەکە چاوەکانی لەسەر هەڵنەدەگرت و لە تەماشاکردنی مرۆڤەکانی زیاتر ڕادەما و هەستی دەکرد دوای ئەوە جارێکی دیکە دەیخەنەوە ناو ژووره تاریکەکانەوە، ئیدی وا بەرەو تەلبەندەکانی دەبەن، ئەمجارە بە جۆر و شوێن و کات و شێوازێکی دیکەوە وا دەرگەی دنیای دەرەوەی لەبەردەمدا دادەخەن و نازانێت چارەنووسی بەچی دەگات، ئاخۆ جارێکی دیکە ئەگەرچی لەناو تەلبەندەکانیشدا بێت و ماوەی چەندان ساڵیش بێت دەرفەتێکی دیکەی ژیانی پێدەبەخشن، یاخۆ ئیتر تەواو ژیانی لێدەسەنرێتەوە و بەرەو مەرگ ڕایدەپێچن.

*  *  *

لە بەغدا بردنیان بۆ بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ئەمن، لە یەکەمین دەرگەدا، پێش ئەوەی بچنە ژوورەوە ئەمنەکان داوایان لێکردن سەری خۆیان نەوی بکەن، دوایی بە بۆکس و تێهەڵدان سەریان بۆ ژێر کوشینەکە نەویترکردن، ڤێجا لە دووەمین دەرگەی دایەرەکە ڕەتبوون، تا یەکێك لە مەئموورە ئەمنەکان، نووسراوەکەی ئەوانی بردە ژوورەوە، ئەوان هەر بەم شێوە مانەوە، هەرسێکیان لەبەر ئازاری پشتیان حەجمانیان لێهەڵگیرابوو، بەڵام بەرگەیان گرت.

ئومێد بۆ چرکەیەك سەری خۆی بەرز کردەوە، چەند خێزانێکی کلۆڵی بینی پێدەچوو بە دوای کوڕەکانیاندا لە چاوەڕوانی وەڵامێکدا، یان سۆراخێکدا بن. دوایی ئەمنەکە هاتەوە و جارێکی دیکە لەوێ هاتنە دەرەوە، کە لە یەکەمین دەرگەی چوونە دەرەوە، سەریان پێ بەرزکردنەوە، ئەمجارە چەند گەڕەك و شەقامێکی بەغدایان بڕی، ئەگەرچی بەرەو چارەنووسێکی نادیار دەیانبردن و نەیاندەزانی بۆ کوێیان دەبەن، بەڵام ئومێد جارێکی دیکە بە بینینی کۆڵان و گەڕەك و شەقامەکانی بەغدا پشوویەکی هاتەوەبەر و چاوەکانی بە دیمەنەکانی دەرەوەی زیندان ڕۆشنتربوون.

هەناسەی بە هەوای دەرەوەی تەلبەندەکان خۆشتر بوو، دڵی بە دیمەنەکانی بەغدا و جەنجاڵی کۆڵان و شەقام و گەڕەکەکانی خۆشتر بوو، وەك ئەوەی ئەم ماوە درێژە لە ژوورە تاریکەکانی ئەمنی هەولێر وەك مرۆڤێکی ئاسایی هەستی بە بوونی خۆی نەدەکرد.

دوای ڕۆیشتنێکی زۆر بە چەندان شەقام و کۆڵان و گەڕەك بردنیان بۆ بەندیخانەیەك کە دوایی زانییان بەندیخانەی (الفضيلية)یە.

کە بردنیان بۆ ژوورەوە، لەوێندەر دەستیان کردنەوە، ئەو ترازاندنی کەلەپچەی دەستیان هێندەیان لا خۆش بوو، وەك ئەوەی بەردرا بن.

بردنیان بۆ حەوشەیەکی گەورە، کە سەرەکەی بە چینکۆ گیرابوو، لە هەموو لایەکی دیوارەکانیشەوە تەلبەند کرابوو، لەناو حەوشەکەدا ژووری بچووك بچووك چێ کرابوون، لە لای پێشەوەی حەوشەکە ڕۆژ لەناو ژوورەکان و پێش ژوورەکانی دەدا، زیندانییەکان هەندێکیان لەبەر هەتاوەکە دانیشتبوون، هەندێکیشیان لە دانیشتن بێزار بوون و پیاسەیان دەکرد.

دوایی لە پرسیارکردن زانییان ئەو زیندانیانە چەند ڕۆژێکە هاتوون و هێشتاکە نۆرەی دادگەییان

نەهاتووە.

ئەو ماوەیەی لەوێندەر مانەوە، تا کاتی دادگەییکردنیان زۆر ناڕەحەت بوون، چونکە نەیاندەزانی کەی دادگەیی دەکرێن و چارەنووسیان بۆ کامە لا یەکلایی دەبێتەوە، یان ژیانێکی دیکەیان پێ دەبەخشرێت، بۆیە تا ڕۆژی دادگەییکردنییان خەو نەدەچووە چاوەکانیان، هەردەم بیریان لای دەرگە بوو، کەی بۆ دادگە بانگ دەکرێن، یان کەی بۆ ڕێی هات و نەهاتیان دەبەن.

(٧)

ئومێد لە هۆڵی دادگەدا لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە چاوەڕوانی کاتی دادگەییەکەیان دەکرد، ژووری دادگەکە لای سەرەوەی هۆڵەکە بوو، شوێنەکەی بەرزتر بوو لە هۆڵەکە.

دەستە دەستە دەیانبردن بۆ ژووری دادگە، ماوەیەکی زۆر مانەوە چەند دەستەیەك بەڕێکران، دوایی نۆرەی ئومێد و پێنج کەسی دیکە هات، بردنیان بۆ ناو قەفەزەکە و لە بەرانبەر دادوەر ڕایانگرتن.

ئومێد لەو پێنج کەسە تەنیا شێرۆ خورشیدی دەناسی، کە پێشتر لە هەولێر دەهاتە لای و کتێبی لێدەکڕی و دواییش بزر بوو، نەیدەزانی بەندکراوە. لەوێ لە هۆڵەکەدا بینییەوە ئەوسا زانی کە گیراوە، بۆیە دیار نەماوە و نەدەهاتە لای بۆ کتێب کڕین، هەر لەوێش زانی ئەو کوڕە کارەکەی سەختە، چونکە

بڵاوکراوەی حیزبی لەدەستدا گیرابوو، چوار کەسەکەی دیکەیش یەکێکیان خەڵکی دهۆك و ئەوی دیکە هی کەرکووك و یەکێکیشیان خەڵکی سلێمانی و ئەوەی دیکەیش کوردی فەیلی بوو خەڵکی بەغدا بوو، لە کاتی ناردنەومیان بۆ ئێران قسەی کردبوو و لۆمەی سەرۆکی فەرماندەی کردبوو.

لای چەپی دادگەکە داواکاری گشتیی لێبوو، لای ڕاستی دادگەکەش پارێزەری دادگە لەسەر کورسی و مێزێك دانیشتبوو، دادگە بۆ هەر چەند کەسێك پارێزەرێکی بۆ دادەنان، کە ئەگەر بە شێوەیەکی ڕووڵەتیش بێت داکۆکییان لێبکات، بەڵام قسەی کۆتایی لای (عەواد ئەلبەندەر) بوو، کە بە پێی میزاج و زەوقی خۆی و بیرکردنەوەی خۆی چۆنی ویستبا بەو جۆرە حوکمی لەسەر بەندکراوەکان دەدا.

داواکاری گشتیی یەکە یەکە تاوانەکانی ئەو چەند کەسەی خوێندەوە، تۆمەتەکانی باسکرد کە ئاڕاستەیان کرابوون، بەڵام لە هی ئومێددا زیاتر پێداگری لەسەر ئەوە کرد، کە چۆن دەبێت پیاوێکی ئەمن بەدەست کەسێکەوە بکوژرێت، ئاخر ئەوە خۆی لە خۆیدا سووکایەتییە بە ڕژێم و تێکدانی ئەمنییەتی وڵات.

کە نۆرە هاتە سەر لێپرسینەوە، حاکم داوای لە ئومێد کرد و پێی وت:

- أسمك الثلاثي

- واتە: ناوی سیانیت؟

- ئومێد ساڵح مەولود.

- شنو لقبك؟

- واتە: نازناوت چییە؟

- ئومێد ڕەشپۆش.

- شنو معنی ڕەشپۆش؟

- واتە: مانای ڕەشپۆش چییە؟

- سيدي يعني يلبس أسود دائما.

- واتە: گەورەم کەسێکە هەردەم ڕەشپۆشە.

- ليش تلبس أسود دائما؟

- واتە: بۆچی هەردەم ڕەشپۆشی؟

- سيدي هذا لقب شعري

- واتە: گەورەم ئەوە نازناوی شیعرییە.

- أذن أنت شاعر وثوري لهذا قتلت المفوض چیاد؟

- واتە: کەواتە تۆ شاعیری و شۆڕشگێڕی بۆیە مفەوز چیادت کوشتووە؟

- لا سيدي أنا ما قتلته بل هو قتل نفسه.

- واتە: نەخێر گەورەم من نەمکوشتووە، بەڵکو خۆی خۆی کوشت.

- هسه قل لنا هذه الجريمة صح أم لا، أنت تعترف بالجريمة مالك؟

- واتە: ئێستەکە پێمان بڵێ ئەم تاوانە ڕاستە، یان نا، تۆ دان بە تاوانەکەتدا دەنێیت؟

ئومێدیش وەڵامی دایەوە و وتی:

- كلا .. سيدي أنا مو قاتل چياد، أذا أنا قاتل ماكنت أتحمل ها التعذيب وما كنت أقاوم، كنت أعترف.

- واتە: نەخێر .. گەورەم، من بکوژی چیاد نیم، ئەگەر من بکوژی ئەو بوام، بەرگەی ئەم هەموو ئەشکەنجەم نەدەگرت و دانم پێدادەنا.

ئینجا حاکم داوای لە پارێزەری دادگە کرد، کە چی دەڵێت بۆ داکۆکی لە تاوانبار و تاوانە ناڕاستەکراوەکەیدا.

ئەویش دانپێدانەنانی ئومێدی کردە بەڵگەیەك و نەبوونی بەڵگەی پێویستی وەك نەبوونی شوێن پەنجەی ئومێد بەسەر دەمانچەکە و بە چەندان بەڵگەی دیکەی داوای لە عەواد ئەلبەندەر کرد، کە دادگە بەزەیی بە بریکارەکەیدا بێتەوە و وەك بکوژێك سەوداکاریی لەگەڵدا نەکەن.

ئینجا دوای دادگەییکردن، بردنیان بۆ خوارەوەی هۆڵی دادگە و چاوەڕوانی ئەنجامی دادگە بوون.

ئەوان هەریەکە لە چارەنووسی خۆی دەترسا، بەڵام ئومێد لە هەمووان زیاتر ناوبانگی خراپی ئەو

حاكمەی دەزانـی، كـە بـە گوێـرەی میزاجـی خـۆی حوكـم دەردەكات و ئەویـش بـە كوشـتنی پیاوێكـی ئەمـن تۆمەتباركـراوە، ئەمـەش لای میزاجـی پیاوێكـی سەرسـەختی بەعـس بـا حاكمیـش بێـت، بێگومـان لای ئـەو حوكمـی هەڕەمەكـی دەبێـت.

ئەو دوو كاتژمێـرەی كـە لـە چاوەڕوانیـدا لەنـاو هۆڵەكـە مابوونـەوە، دڵیـان لەنـاو دەسـتیان بـوو، تـرس هەمـوو گیانـی تەنیبـوون، بەتایبەتـی ئومێـد كـە بیـری لـەوە دەكـردەوە، ئەگـەر ئـەو حوكمـی سـێدارەی بـۆ دەربكـەن، یـان حوكمـی هەتـا هەتایـی، تەنانـەت حوكمدانـی چەندیـن سـاڵیش، ئاخـۆ خاتـوون چـی بەسـەر دێـت و بـە تەنیـا لـەو ماڵـەدا چـی بـكات و چۆن بژیـەت كـە لـە كتێب بترازێت هیـچ شـتێكی دیكـەی تێدا نییـە تەنیایـی بڕەوێننـەوە.

خـۆ ئەگـەر منداڵیـان هەبووایـە باشـتر بـوو، بـەڵام لـە ماڵێكـدا تەنیـا و تەنیـا كتێـب و دەفتـەر و كاخـەز چۆن تەنیایـی و سـەلوای ڕۆحـی برینـداری دەبـن و چۆن ئومێدی لەبیـر دەبەنـەوە.

ئیتـر وا بـۆ نـاو هۆڵـی دادگـە بانگكـران و چاوەڕوانـی ئـەوە دەكـەن، كـە عـەواد ئەلبەنـدەر حوكمـی سـڕینەوە لەسـەر دنیـا، یـان ژیانێكـی دیكـەیـان پێدەبەخشـێت.

ئینجـا دوای ئـەو حوكمدانـە چارەنووسـی خاتوونیـش بەدیاردەكەوێـت، ئاخـۆ بـێ ئومێـد دەمێنێتـەوە، یانیـش

جارێکی دیکە ئەگەر دوای چەندین ساڵ حوکمیش بێت دیسانەوە لەگەڵ ئومێد ماڵێکی تژی لە کتێب ژن و مێردایەتییان بۆ نوێ دەکاتەوە.
کە لەبەردەم چاوەڕوانی بڕیاردانی حاکم وەستابوون، هەریەکە لای خۆیەوە نەیدەزانی دوای ئەو بڕیارەی ئەلبەندەر و حوکمدانی ئاخۆ عیزرائیل وەریاندەگرێ، یان ئیسرافیل باوەشی مانەوەیان بۆ دەکاتەوە.
ئەو چرکە ساتەی تا مان و نەمانی دیاری دەکرێت، لای ئومێد سەختترین ساتەکانی ژیانی بوو، کە هەر لە منداڵییەوە تا ئەو چرکەساتە لەو دەمانە ناخۆشتر و سەختتری هەست پێنەکردبوو لە ژیانیدا.
دوای ئەوەی حاکم بڕیارەکانی خوێندەوە بۆ ئومێد حوکمدانی هەتا هەتایی دەرچوو، ئەگەرچی لای ئەو حوکمەکە ناعەدالەت بوو، چونکە لەبری ئەوە بۆی دەرکرابوو، کە تاوانێکی کردبێت و پیاوێکی ئەوانی لەناو بردبێت و واش نەبوو، بەلام لەگەڵ ئەوەش تۆزێک پشووی هاتەوەبەر، هەر هیچ نەبێت ئەو چاوەڕوانی حوکمی مەرگی دەکرد، لە حاکمێکی بێ بەزەیی و دڕندە و شۆڤێنی، بەلام ئەوا جارێکی دیکە هیوایەکی بۆ ژیان پێبەخشرا، هیچ نەبێت ئەگەر تەمەنی لە ژیاندا بمێنێت، ئەوا هیوایەکی بەخشین، یان گۆڕانکارییەکی سیاسی، یان هەر ئەگەرێکی

دیکـه لەوانەیـه جارێکـی دیکـه ژیانـی ئاسـایی خـۆی بدۆزێتـەوە و لـە نوێـوە بگەڕێتـەوە ژێـر چەتـری هاوسـەری و هاومـاڵـی و هاوژیانـی لەگـەڵ خاتوونـدا.

کـه گەڕانـەوە نـاو هۆڵەکـه ئەوانـەی لـەوێ بـوون پرسـیاریان لێکـردن، کـه ئەنجامەکـیان چـۆن بـووە، هـەر کەسـه حوکمدانـی خـۆی باسـکرد، لـەو چەنـد کەسـەیان کـه پێکـەوە دادگـەیـی کـران، تەنیـا کـوردە فەیلییەکـه حوکمـی لـه سـێدارەدانـی بـۆ دەرچـوو، چونکـه قسـەی بـه سـەرۆکـی فەرمانـدە وتبـوو، لای عـەواد ئەلبەندەریش ئـەوە کوفرێکـی گـەورە بـوو.

کەسـانـی نـاو دادگـه پیرۆزبایـیـان لێکـردن، ئەگـەرچـی حوکمدانەکانیشـیان بـه بـێ ویژدانـی و غـەدر دەزانـی، بـەڵام بـەوە دڵیـان دەدانـەوە، کـه دەبێـت سوپاسـی خـوا بکـەن، کـه ئەمجـارەش تەمەنیـان بـۆ نووسـرایەوە، ئـەدی ئەگـەر وەك کـوردە فەیلییەکـه هەمووتـان حوکمـی لـه سـێدارەدانتان بـۆ دەرچووبایـە چیتـان دەکـرد.

هەریەکەیان حوکمی جیا جیایان بەسەردا سەپێندرا.

ئیتـر کەلەپچەیـان لـه دەسـت کـردن و سـواری ئۆتۆمبێلێکـی داخراویـان کـردن.

* * *

بردنیان بۆ شوێنێك لە دەوروبەری بەغدا كە ناوی ئەبو غرێب بوو، دوای چەندان دەرگە و قاوشێك بردنیان بۆ بەشێكی دیكە، دواتر زانییان ئەوە بەشی حوكمە قورسەكانە لەم بەندیخانەیەدا.

كە گەیشتنە ئەوێ نیوەڕانە بوو، دوو ڕۆژ و دوو شەو بوو نانیان نەخواردبوو، زۆر برسی بوون، دوایی بردنیان بۆ ژوورێكی فرەوان كە نزیكەی بیست كەسێكی لێبوو، لەو ژوورەدا دوای ئەو هەموو ماوەیە زیندانییە لە ئەمنی هەولێر توانیان بە پشوویەك بدەن و دانیشن و قاچەكانیان ڕاكێشن، تاوەكوو ئێوارە نانیان بۆ نەهێنان، دوایی كە شلەی سڵقیان بۆ هێنان، لە برسان وایاندەزانی خۆشترین خواردنیان بۆ دانراوە و بڕێك برسێتیان كەم بووەوە.

ئەوشەوە تا بەیانی توانیان قاچیان ڕاكشێنن و بنوون، بەیانی ئومێد و دوو كەسی دیكەیان جیاكردەوە و كەلەپچەی دەستییان لێكبەستنەوەو بەپێ بردنیان بۆ بەشی حوكمە تایبەتییەكان.

لە بەشی حوكمە تایبەتییەكاندا سەرەتا ئومێد و چەند كەسێكی دیكەیان بردن بۆ ژوورێكی دیكە، ئەو كاتە ئومێد ژوورەكەی ئەمنی هەولێری بیركەوتەوە و ئاواتەخوازی ئەوە بوو جارێكی دیكە نەخرێتە ژوورێكی وەها، وا ئەمجارەش لەوێ خرانە

یەکێك لەو ژوورانە، کە پێی دەگوترا مەحجەر.
هەموو زیندانییەك کە دەنێردرایە بەشی حوکمە تایبەتییەکان، دەبووایە بەلانی کەم حەوتوویەك میوانی ئەو ژوورە بووایە، لەوێ لەم ژوورەدا زۆرینەی بەندکراوەکان بە تۆمەتی جیا جیا لەسەر سیاسەت گیرابوون.
لەوێندەر چەند کەسێك زۆر سەرنجی ئومێدی ڕاکێشا، ئەگەرچی خۆشی خەمەکانی کەم نەبوون، هێشتە لە شوێنێکی تۆزێك ئارام ئۆقرەی نەگرتبوو، بەڵام هەڵسوکەوتی چەند کەسێك لەو گرتووانەی ناو مەحجەر سەرنجی بۆ لایان ڕاکێشابوو، یەکێك لەوانە کەسێك بوو هەردەم وەك شێت ڕەفتاری دەکرد و بەردەوام داوای جگەرەی دەکرد، کە جگەرەیەکیان دەدایێ و هەڵیدەمژی و دووکەڵەکەی بەبا دەکرد و بەدەم هەڵمژینی دووکەڵی جگەرەوە خەمەکانی خۆی دەڕەواندەوە، تۆزێك دادەمرکایەوە، ئەو کەسە لەوێ پێیان دەوت شێتۆکە.
دوایی لە زاری کەسانی ناو ژوورەکە زانی، کە ئەوە کەسێك بوو ناوی پرۆفیسۆر عەبدولزەهرە کازم ئەلموسەوی بوو، خەڵکی کەربەلا بوو، شیعە مەزەب بوو، لە ئەمەریکا دکتۆرای لە

فیزیای ئەتۆمی تەواو کردبوو، لە زانکۆی بەغدا، کۆلیجی زانستی پرۆفیسۆر بوو، تەنیا وانەی بە قوتابیانی دکتۆرا و ماستەر دەگوت، سەرەتا ڕاگری کۆلیج بوو، بەڵام لەبەرئەوەی بەعسی نەبوو، پلەیان لە ڕاگری کۆلیجی زانستەوە کردە، سەرۆکی بەشی فیزیا لەم کۆلیجەدا، بەڵام دواتر بەوەش وازیان لێ نەهێنا، هێندە ڕاپۆرتییان لەبارەوە نووسی، تا لە سەرۆك بەشیش هێناویانەتە خوارەوە و تەنیا وەك وانەبێژ لە کۆلیج ماوەتەوە، دوایی ڕاپۆرتنووسەکان وازیان لێنەهێناوە، دوای گەڕانەوە لە کۆنگرەیەکی زانستی لە بەریتانیا، ڕاپۆرتنووسێکی کۆلیجەکەیان وای لەسەر نووسیوە، گوایە زانیاریی لەبارەی دامەزراوە زانستی و تواناسازی و نهێنی زانستی بە دەزگەیەکی هەواڵگری ئیسرائیلی فرۆشتووە.

لە ڕاستیشدا ئەو پیاوێکی نیشتمانپەروەر و زانست دۆست بوو، هەرگیز بیری لە سیاسەت نەدەکردەوە، هەر بۆیە نە تێکەڵی حیزبە نهێنییەکانی ئۆپۆزسیۆن و نە حیزبە نهێنییەکانی تایفەگەری دەبوو، نەدەشبوو بە بەعسی، بگرە حەزی دەکرد وەك زانستخوازێك تەنیا خزمەتی وڵاتەکەی خۆی بکات، بەڵام دیارە لای بەعس هاوکێشەکە وا

دەخوێنرایەوە (ئەگەر لەگەڵ من نەبیت، کەواتە تۆ دژی منی، یاخۆ لەگەڵ نەیارانی منی)
پرۆفیسۆر عەبدولزەهرە هێندە ڕووبەڕووی لێدان و فەلاقە و ئەشکەنجە و تێهەڵدان و کارەبا لێدان بووبووەوە، ئیدی وەك نیمچە شێتێك کەوتبووە ئەو ژوورە و وەك ئەوان نێردرابوو بۆ بەشی حوکمە تایبەتییەکان و حوکمی هەتا هەتایی بەسەردا سەپێنرابوو.
ئەو پیاوە ناویان بە شێتۆکە دەهێنا، تەنیا بە پێدانی جگەرەیەك تۆزێك هێور دەبووەوە و ئۆقرەی دەگرت، بەڵام ئەگەر باسی زانستی، یان پرسیاری سیاسییان لێکردبووایە، وەك چۆن لە زانکۆ بێت بە رێك و پێکی وەڵامی دەدانەوە، بەڵام تێکەڵی گوتووێژ و باسی سیاسەت نەدەبوو، هەندێکیش بێویژدانانە تۆمەتی ئەوەیان دەدایە پاڵ کە بە ئەنقەست خۆی شێت کردبێت.
ئومێد کە دۆخی پرۆفیسۆری بینی و کەسانی دیکەی ناو ئەم ژوورەی بە وردەکاری و نهێنییەکانیانەوە زانی، تۆزێك پشووی هاتەوەبەر و لە دڵی خۆیدا بڕوای بەوە هێنا، کە ئەوەی ئەو بینیوویەتی، هەر هێندە نییە، بگرە کەسانی لەویش بە ئازارتر و ستەملێکراوتر و خراوتریش هەیە و

هەستی بەوەکرد، ڕەنگە ئەو ئازارانەی ئەو و ئەو ئەشکەنجە و ڕۆژانی سەختی ئەو لە زیندانەکانی بەعس کەسانی وەك پرۆفیسۆر و گەلێك جۆر چیرۆکی خەمگینی دیکەیش هەبن، ئێستە وا لەو زیندانەدا دەیانبینێت، یەکێکی دیکە لەوانە چیرۆکی حوسێن هینداوی بوو، کە بەسەرهاتەکەی لە هی پرۆفیسۆر سەرنجڕاکێشتر و جەرگبڕتر بوو، ئەو قوتابی کۆلیجی پزیشکی بوو، حەسەنی برای لە فەرەنسا، زانکۆی سۆربۆن خوێندنی دکتۆرای لە ئەدەب تەواوکرد و گەڕایەوە بەغدا، ئەو بێئاگا لە هەموو شتێك هەر کە گەیشتە فڕۆکەخانە، هاتن چاویان بەستایەوە و بردییان، دوایی زانرا لە کاتی خوێندنیدا لەگەڵ بەرهەڵستکارانی عێراق و بەتایبەتیش کۆمۆنیستەکان پێوەندیی هەبووە و باسی سیاسەت و ڕەخنەی لە حیزبی بەعس و سەدام گرتووە.

کەسوکاری و بەتایبەتیش حوسێن لە زۆر دەرگەی دا هیچ سۆراخی نەبوو، بێ هیوا بوون لە مانی.

ڕۆژێکیان بۆ وانەی توێکاری لەگەڵ قوتابیانی پۆلەکەی لە دەوری لاشەیەك کۆبوونەوە، حوسێن تووشی شۆك بوو، بورایەوە، حەسەنی برای بوو وەك شێتی لێهات، کەسوکاری زانییان، بەڵام

نەیانتوانی لاشەکە وەرگرنەوە و بینێژن، دائیرەی ئەمن لەگەڵ چەندان جەستەی دیکە بۆ قوتابیانی کۆلیجی پزیشکی ناردبوو.

حوسێن لەبەر خۆی نەوەستا جوێنی بە سەرۆکی فەرماندە و حیزبی بەعس دا، نەیتوانی کۆنترۆڵی خۆی بکات، ئەوان هاتن قۆڵبەستیان کرد و بە چاوبەستراوەیی بردیان، سەرەنجام لە زیندان کەوتبووە لای ئومێد و حوکمی هەتا هەتایی بۆ دەرچووبوو، لە بەشی حوکمە تایبەتییەکاندا ڕۆژانی ڕەشی خۆی بەڕێدەکرد.

* * *

ئومێد بۆ ماوەیەکی کورت گەڕایەوە ناو باری خۆی، کە لە سەربانی ماڵی خوشکی بوو، دەیویست خۆی فڕێ بدات و کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت، بەڵام یادەوەرییەکان هێشتاکە وازیان لێنەدەهێنا و بینەقاقایان گرتبوو، ئەمجارە هێشتاکە هەر یادەوەری ژوورەکەی مەحجەری زیندانی ئەبوغرێبی تێنەپەڕاندبوو، کە شریتی یادەوەرییەکانی و بیرکەوتنەوەکانی جارێکی دیکە لەم ژوورەدا نیشتەوە، چونکە شوێنەکەش سیخناخ بوو بە خەڵکی جیا جیا و لە تەمەنی جیا جیا و کەسایەتی و چۆنیەتی تۆمەتی جیاجیاش هێشتاکە لەم شوێنەدا نەچووبوون بۆ قاوشەکانی حوکمە تایبەتییەکان.

ئەمجارە بیری کەوتەوە، کە یەکێکی دیکە لەو کەسانەی لە مەحجەردا سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو، کەسایەتیی فازیل ئەلبەغدادی بوو، کە خەڵکی گەڕەکی ئەلسەورە بوو لە بەغدا و دەرچووی کۆلیجی شەریعەی زانکۆی بەغدا و فەرمانبەری وەزارەتی ئەوقافی عێراق بوو، ئەو پیاوە تەمەنی سی و دوو ساڵان بوو، نووسەری چەندان کتێبی ئایینی بوو، بەڵام لە دوا کتێبیدا کە بە ناونیشانی (ڕەوانبێژی و دەلالەتی زمانەوانی لە شیعرەکانی ئیمام عەلی دا) بوو لەبەر ئەوەش کە کەسێکی شیعە مەزەب بوو،

ئەو کتێبەشی لەبارەی ئیمام عەلی، سەرنجی پیاوانی بەعسی بۆ ئەوە ڕاکێشا بوو، کە ئەو پیاوە پێوەندیی بە ڕێکخستنەکانی نهێنی حیزبە ئیسلامییە شیعەکانەوە هەبێت، بۆیە ڕاپۆرتەکانی نەیارانی و سیخوڕانی ئەمن لە وەزارەت گەیاندییە ئەم ژوورە، کە لەگەڵ ئومێد و کەسانی دیکەدا چاوەڕوانی تەواوکردنی ئەو ڕۆژانەن لە مەحجەر و بیانبەن بۆ قاوشەکانی حوکمە تایبەتییەکان.

بەغدادی سوێندی گەورەی بە عەلی و حوسێن و عەباس دەخوارد، سەرەتا لە کەس نێزیك نەدەبووەوە، دواتر وردە وردە لەگەڵ ئومێد ئاشنا بوو، هەردووکیان نهێنی ژیان و گرتنی خۆیان بۆ یەکدی دەگێڕایەوە و عەشقی هەردووکیان بۆ کتێب و خوێندنەوە و بوونی هەردووکیان وەك نووسەر وایکرد سۆزیان بۆ یەکدی ببزوێت. ئەگەرچی بیروباوەڕیان لێکدی جیاوازبوو، بەڵام خۆشەویستی ڕۆشنبیری و نووسین و تۆمەتبارکردنیان بە دوو بابەتی وەك یەکدی وایلێکردبوون، تا لەم ژوورە بوون هەڵسوکەوت و دانیشتن و نووستنیان لە نێزیك یەکدیبوون و لەوانی دیکە زیاتر سەوداکارییان لەگەڵ یەکدی دەکرد.

فازیل پیاوێکی تێکسمڕاوی بەژن و باڵا مامناوەندی بوو، قژی ڕووتابووەوە، بەڵام ڕوومەتەکانی سوور و پڕ

بوون، چاوەکانی شین و ئێسك سووك بوو، هەردەم دەم بە خەندە، هەردەم نزای دەخوێند، بەڵام لای ئومێد ئەوەی درکاندبوو، کە سەرسام بوو بە کەسایەتی و نووسین و شیعر و فەلسەفە و تێڕوانین و بۆچوونەکانی ئیمام عەلی، هەربۆیە کتێبێکی لەبارەوە نووسیوە، ئەمەش گومانی لای بەعسییەکان چێ کردووە و بە ئەندامی نهێنی حیزبە ئیسلامییە شیعەکان تۆمەتبار کراوە.

سەرەنجام لە دادگەکانی بەعس و بە حوکمدانی عەواد ئەلبەندەر، وەك ئومێد حوکمی هەتا هەتایی بۆ بڕابووەوە، لەگەڵ ئەمەش کە بێ گوناح بوو، بەڵام بەو حوکمەش ئومێدێکی بۆ داهاتوو و لێبووردن و هەر گۆڕانکارییەك خۆش بوو، هیچ نەبێت لە حوکمی سێدارە دەرباز بووە و دەشبێت ڕۆژانی داهاتووی بەڕێبکات و خۆی نەخاتە ناو بەلەمی نائومێدی و ڕووخانەوە.

* * *

ئومێد چیرۆك و بەسەرهات و كەسایەتیی دیكەیشی بیردەهاتەوە، بەڵام لە مێشكی خۆیدا ئەم شریتەی ڕابردووی وەستاند و جارێكی دیكە گەڕایەوە بۆ ئەو كەسایەتییەی كە لە سەربانی ماڵی خوشكی وەستاوە و لەبەر جیابوونەوەی خاتوون و دەرچوونی لە ژیانیدا وا چاوەڕوانی ئەو كاتانەیە، یان چاوەڕوانی وێستانی یادەوەرییە تاڵ و ناخۆشەكانی ژیانییەتی تاوەكوو ئەویش بكاتە خاڵی كۆتایی و چی دی ژیان نەیكوژێت.

كە ماوەكەیان لە مەحجەر تەواوبوو، ئومێد و پرۆفیسۆر عەبدولزەهرە و فازیل بەغدادی و چەند كەسێكی دیكەیان بردن بۆ ناو قاوشەكانی بەشی سزا تایبەتییەكان.

ئومێد كەوتە قاوشی ژمارە (٣) و جلێكی ڕەنگ قاوەییان دایێ و جێگەیان بۆ دیاركرد، كە دووەمین قاتی قەرەوێلەیەك بوو، لەوێ برادەرێكی خۆی دۆزییەوە، كە لە كاتی قۆناخی ناوەندی لەگەڵیدا بوو، ئەویش ڕەسووڵ جەوهەر بوو، كە لە قوتابخانەشدا ئەندامی یەكێتیی قوتابیانی گشتی بوو واتە شیوعی بوو، ئەویش سێ مانگ بوو گیرابوو و بڵاوكراوەی حیزبی شیوعی لەدەست گیرابوو، بە حوكمی هەتا هەتایی حوكم درابوو.

ڕەسووڵ، کە ئومێدی دیت هێنایە لای خۆی و لە قەرەوێڵەکەی خۆیان جێگەی بۆ کردەوە، دوایيش کە تەماشای جلە شڕ و شەپڕێوەکانی ئومێدی کرد، زۆر پێی ناخۆش بوو بەم جلە دڕاو و چڵکنە ببینێت، بۆیە لەگەڵی چوونە حانووتی زیندان و قاتێك جلی قاوەیی زیندانی نوێی بۆ کڕی، چونکە ئەو جلەی کە ئەو وەریگرتبوو زۆر کۆن و دڕاو بوو. ئومێد کە ئەو جلانەی لەبەر کرد هەستی بە ئاسوودەییەکی زۆر کرد، ئەوسا زانی لە دنیادا هێشتاکە برادەری بە وەفا و چاك هەیە، دنیاش خێری پێوە ماوە، چونکە لەوەتەی لە زیندانی ئەمنی هەولێرەوە بوو جلەکانی نەگۆڕابوون و بۆنی تۆز و خۆڵ و چڵکی زیندان و گوکێچ و ئەسپێ و بۆن میزی پێوە بوو، وەك جلی شێتان وابوو، بە لەبەرکردنی ئەم جلە نوێیانە هەستی کرد گیانی هاتەوە سەرخۆ و هەزاران نزای خێری بۆ ڕەسووڵی کۆنە برادەر و هاوپۆلی کرد، چونکە بە هۆی ئەو جلە نوێیەوە، هەستی بە جۆرە ئاسوودەییەکی گیانی کرد و وایزانی چووەتەوە ناو ماڵەکەی خۆی و لەگەڵ خاتوون پێکەوە وەك جاران ژیانی ئاسایی خۆیان بەڕێدەکەن.

دوو هەفتە جارێك دیدەنی هەبوو، کەسوکاری

زیندانییەکان دەیانتوانی سەردانی گیراوەکانیان بکەن، بۆ ئومێد جارجارە خاتوون و خوشکەکەی دەهاتنە سەردانی و دلاوەر دەیهێنان و شەوێك لە بەغدا دەمانەوە و بۆ ڕۆژی دواتر دەگەڕانەوە، هەموو جاریش خواردن و جلوبەرگ و کتێب و ڕۆژنامەیان بۆ دەهێنا، بێگومان ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانەی کە لەلایەن حکوومەتەوە دەردەچوون وەك گۆڤاری (کاروان) و (بەیان) و (ڕۆشنبیری نوێ) و هی دیکە، کتێبەکانیش تەنیا ئەوانەی چاپکراوی حکوومەت و دەزگەی ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بوون، بۆیە کە کاتی سەردان دەهات، دلاوەر ئەم گۆڤار و کتێبانەی بۆ ئومێد ئامادە دەکرد، لەوێش ئومێد دوای خوێندنەوەی خۆی دەیدایە هاوڕێکانی دیکەی زیندان.

ئومێد لەو قاوشەدا، کە سەرەکەی بە جەمەلۆن گیرابوو، قەرەوێڵەکەی خۆی وەك ژوورێکی بچووك لێکردبوو، زۆرینەی کاتەکانی، کە پشوو بوو بە خوێندنەوە خەریك بوو، لەوێ کاتەکان هەموو دیارکرابوون، کاتژمێر هەشتی ئێواران هەموو شتێك قەدەخە بوو، دەبووایە هەمووان بە ئاگاییەوە بێدەنگ بەرامبەر تاکە تەلەڤیزیۆنەکەی ناو هۆڵەکە دابنیشن، کە خۆیان دایاننابوو، دەبووایە ئاگەداری

هەواڵ و دەنگ و باس بن، بۆیە هەمووان وەك لێپرسینەوەی تاقیکردنەوە گوێیان دەدایێ، چونکە جارجارە دەهاتن لە زیندانییەکیان دەپرسی ئەگەر ئاگای لە هەواڵەکان نەبووایە دەیانبرد حەسیر مەیدانییان دەکرد و وەك مردوویەك دەیانهێنایەوە، بۆیە دەبووایە گوێ لە هەواڵەکان بگرن.

دوازدەی شەویش بەرنامەکانی تەلەڤیزیۆن کۆتاییان پێدەهات و دەبووایە هەمووان بخزێنە ناو نوێنەکانیانەوە و هەموو ئاگەدارکردنەوەیەکیان بۆ زیندانییەکان لە ڕێگەی ئەم خۆفکانەوە بوون، کە لەبن جەمەلۆنەکان دایاننابوون و ئاگەداری و بانگکردنیان پێ دەدایە دابەزیوەکانی زیندان.

ڕۆژێ دوو جارانیش لە گۆڕەپانی دەرەوەی هۆڵ و جەمەلۆنەکەدا سەرژمێری دەکران، کە کارمەندانی زیندان پێیان دەوت مەستارِ، یەکەمین جاری سەرەتای دەستپێکردنی دەوام لە حەوشەکەدا پێنج پێنج ڕیزیان دەکردن و وەك ئاژەڵ دەژمێردران، دووەمین جاریش پێش کۆتایی هاتنی دەوامی فەرمی بە خۆفك بانگ دەکران کە بێنە گۆڕەپان و جارێکی دیکە دەیانژماردنەوە.

لە هەموو هۆڵێکدا کەسێکیان هەبوو زانیاری و هەواڵ و جموجۆڵی ناو هۆڵەکەی بۆ بەرپرسانی

بەندیخانە دەبرد، ئەو کەسە دیار بوو هەمووان دەیانناسی چاودێری ئەوان گەنجێکی جوانی دەموچاو پڕی خەڵکی بەغدا بوو. کەس نەیدەزانی لەسەرچی گیرابوو، خۆشی لای کەسیان نهێنی خۆی نەدەدرکاند، گیراوەکان گومانی ئەومیان لێدەکرد، کە پیاوی ئەمن بێت و وەك چاودێر هێنابێتیانە ئەم زیندانە و وەك بەندییەك نیشانی ئەوانیان دەدا.

هەر لە ڕێگەی خۆفکەکانی جەمەلۆنەکەدا یەکێکیان بویستایە بانگیان دەکرد، یان بانگەوازی داخستنی دەرگەکان و کرانەوەیان دەدا، هەر بە هۆی ئەم خۆفکانەوەش، لە کاتی دیاریکراوەوە پەخشی ڕادیوی بەغدای ناوەندی دەخرایە سەر، چونکە بەندییەکان بۆیان نەبوو ڕادیۆی خۆیان لابێت، ئەم ڕادیۆیە لە هەموو هۆڵ و گۆڕەپان و جەمەلۆنەکاندا لە یەك کات و هەمان شت بوو.

ئێواران دەرگەی دەروازە و گۆڕەپانەکانیان کلۆم دەدا و دەبووایە هەمووان بچنەوە ناو هۆڵەکانیان.

زیندانییەکان زۆرینەیان لە کاتی بێکاریدا خەریکی چنینی ملوانکەی زەنگیانە و جانتا و چنینی کڵاش بوون، کەرەستەکانیشیان لەو کەسانە دەکڕی،

که ڕێگە پێدراو بوون لە زیندان شت بفرۆشن، ئەگەرچی ئومێد لەوێ فێری کڵاش چنین بوو بوو، بەڵام زیاتر کاتی خۆی بە خوێندنەوە و گوتووێژ لەگەڵ برادەرانی ناو زیندان بە تایبەتیش لەگەڵ کەسانی ناو هۆڵەکە تەرخان دەکرد.

زۆر لە نووسەر و ڕۆشنبیرانی دیکەی ناو هۆڵەکەی ئومێد ئەوانیش بەشداری گوتووێژیان دەکرد و کەسانی کە تازە دەهاتنە لایان ئاگەدار دەکردەوە و وانەی کوردایەتی و مێژووی کورد و بابەتی مارکسی و شۆڕشگێڕی و ئەدەبییان بە کەسانی دیکە و گەنجانی ئەوێ دەگوت، بەڵام دوور لە چاوی چاودێر و لە کاتی پیاسەکردن لە گۆڕەپانەکەدا.

ئەوانەی باری داراییان باش نەبوو، هەموو کات خۆیان بە چێکردنی خانوو لە دار و مقەبا و دروستکردنی جانتا و جزدانی ژنان و کڵاش و چەندان کاری دەستی دیکە خەریک دەکرد.

ئومێد لە کاتی بەیانیان و شەواندا دەفتەرەکەی لەو شوێنە دەردێنا، کە لێی دەشاردەوە و شیعری خۆی تێدا دەنووسی و هەر جارێکیش کە خوشکەکەی، یان خاتوون، یاخۆ دلاوەر دەهاتنە دیدەنی، دوو هەفتە جارێك یەکێك، یان دووانیان هەردەهاتن هەر جارەی شیعرێکی خۆی لە دەفتەرەکەدا لێدەکردەوە و پێی

دەناردنەوە.

دلاوەر ئەرکی کۆکردنەوەی شیعرەکانی لە ئەستۆ گرتبوو، هێشتا یەکەمین ساڵی نێو زیندانی تەواو نەکردبوو، دیوانێکی شیعری بە ناونیشانی (لە دەفتەری زیندانەوە) بۆ بردە ڕەقابە و مۆری بڵاوکردنەوەی بۆ لێ درا و چاپی کرد، بەڵام نەیتوانی دانەیەکی کتێبەکە بێنێتە زیندان و ئومێد ببینێت.

زیندانی ئەبوغرێب هۆڵ و گۆڕەپانی زۆربوون، هەندێك ژوور و زیندانیشی تێدابوو، کە کەس ئەوانەی نەدەدیت و دیدەنییان نەبوو، تەنیا ئەو زیندانیانەی وەك ئومێد و کەسانی دیکەی ناو بەشەکان بەلایاندا ڕەت دەبوون، دەیانزانی ئەو ژوورانە لەوەتەی هەیە بە ڕووی زیندانیانی ناوی نەکراونەتەوە و کەسانی ناویان ڕۆژیان بەرنەکەوتووە، لە ڕێی چوونی خواردنەوە دەیانزانی، کە کەسانێکی تێدا ئاخنراون و هێشتا لە ژیاندا ماون و هیچ لێبووردنێکیش ئەوانی نەدەگرتەوە، بۆیە ئەگەر بیانهێنابووانە دەرەوەی ژوورەکان لەوەی بوو چاویان هەڵنەیەت، چونکە لە دنیای ژوورە تاریکەکاندا لە دنیای دەرەوە دابڕابوون و نەیاندەزانی لە دەرەوەی ئەو ژوورانەدا، سەردەم هی چ حوکمڕانێکە و لە دەرەوەی

ژوورەکانیاندا چی دەگوزەرێت و کەسوکارییان چییان لێ بەسەر هاتووە، تەنیا بە خەون و خۆزگە بوونی خۆیان دەبینی.
هۆڵەکانی زیندان هیچ مەرجێکی ژیانی تێدانەبوو، بە هاوین گەرم بوو، بە چەند پانکەیەك فێنك نەدەبوونەوە و بە زستانانیش گەرم نەدەبوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش زیندانییەکان خۆیان لەگەڵ ئەم بارودۆخە ڕاهێنابوو.
لە ڕۆژانی دیدەنیدا هۆڵەکان لە هاویندا گەرم بوون، زیندانییەکان چادرییان لە گونیە چێ دەکرد، هەر کەسێك لەگەڵ کەسوکار و خزمەکانی دەچوونە ژێر ئەم چادرانە تاوەکوو لەبەر هەتاوی سووتێنەری هۆڵەکاندا، وەك سێبەرێك لەژێریدا بحەوێنەوە و پێکەوە نان بخۆن، تا دەڕۆیشتنەوە، ڤێجا دوای تەواوبوونی دیدەنییەکان ئەو چادر و گوشانە کۆدەکرانەوە و سەرژمێری دەکران و یەکە یەکە ناویان بانگ دەکردن و دەیاننادرنەوە هۆڵەکانی خۆیان.
ئومێد و هاوڕێکانی لەناو زیندانەوە، کاتێك هەواڵە ناخۆشەکانی میللەتەکەیان دەزانی لە کوشتن و دەربەدەری و کیمیاباران و ئەنفال و وێرانکردنی گوند و شار و شارۆکە و ڕاگوێزانی خەڵکی سڤیل

و هەموو جۆرە کوێرەوەرییەکانی میللەتەکەیان، ئەوسا جگە لە خەمی جێهێشتن و سەختی ژیانی خێزانەکانیان و ئەم هەموو هاتن و چوونە و خەرجی خێزانەکانیان لە چێکردنی خواردن و هاتن، بەم سەختییەی ژیانیانەوە، کە دەبوو لە دەمی خۆیانی بگرنەوە بۆ کاتی دیدەنی، پارە قەرزبکەن و بێ باوک منداڵەکانیان بژێنن.

لەگەڵ ئەوەش خەمێکی دیکەی گەورەتر، کە خەمی نیشتمان و هەواڵە ناخۆشەکانی شەڕ و دڕندەیی ڕژێم هێندەی دیکە ڕۆژ دوای ڕۆژ و سات دوای سات و چرکە دوای چرکە لە چاوەڕوانی هاتنە دەرەوە و ڕزگاربوونیان بوون، لەم ڕەوشە سەختانە، تاکە ڕێگەی دەربازبوونیشیان تەنیا و تەنیا گۆڕانی بارودۆخی سیاسی، یان بەم هیوا خۆشەی کە لێبووردنی گشتیی بتوانێت ڕزگاریان بکات لەم تەلبەندە سەختانەدا.

ئومێد لەم زیندانەدا خەمی گەورەی خاتوون بوو، کە هەراسانی کردبوو، چونکە بە تەنیا مابووەوە، ئیتر ئەوەبوو دوای گیرانی ئومێد، خاتوون ماڵەکە بۆ دلاوەر جێدەهێڵێت و دەچێتە ماڵی نەسرینی خوشکی ئومێد، چونکە لەبەر قسەی خەڵک نەیدەتوانی لەو ماڵەدا لەگەڵ پیاوێک بمێنێتەوە، هەرچەندە

نێزیکترین هاوڕێ و کەسی ئومێدیش بوو، وەك کوڕی ئومێد و خاتوونیش بوو.

دلاوەر پێشی وت، کە ئەو ئیتر لەم ماڵەدا نامێنێتەوە و دەچێتە هۆتێل، بەڵام ئەو بیانووی ئەومبوو بە دلاوەری گوت:

- ئاخر من ئافرەتم و ناشترسێم، بەڵام بە تەنیا لە ماڵێکدا ناتوانم بژیم.

بۆیە دلاوەر ڕێی بە خاتوون دا، تاوەکوو بچێتە ماڵی نەسرین و خۆشی لە ماڵەکەدا بمێنێتەوە.

ئومێد ئەگەرچی لە خاتوون دوورکەوتەوە، بەڵام لە زیندانیش بیر و هۆشی هەردەم لای ئەو بوو، لەگەڵ ئەمەش لە زیندانیشدا توانی قاوشەکەی خۆی بکاتە شوێنی گردبوونەوەی ڕۆشنبیران، کاتەکانی خۆی بە فیڕۆ نەدەدا و هۆشیاری دەبەخشی و خەباتێکی دیکەی لەناو زیندان دەستپێکرد، کە بۆ ئەو جێی شانازی بوو.

* * *

جارێکی دیکە شریتی یادەوەرییەکانی وێستا، زۆری تینوو بوو، لە سەربان چووە خوارەوە و تینوێتی خۆی شکاند و خۆی ڤالاکردەوە، و دەموچاوی خۆی شووشت و تۆزێك هاتەوە سەرخۆ، ماڵی خوشکی ئەو ڕۆژە کەسیان لە ماڵ نەبوون، چاوێکی بەو ژوورەدا خشاند، کە ئەو لێی دەنووست، دەرگەی کەنتۆرەکەی کردەوە، ئەلبوومەکانی دەرهێنا و تەماشای وێنەکانی کرد، وێنەکانی خاتوون هەست و سۆزیان داگیرکرد، وەك ئەو ئاشقە وابوو چەندان ساڵ خۆشەویستەکەی نەبینێت، پاشان بۆی دەرکەوێتەوە، ئەویش نەزانێت چۆن ناخی خۆشەویستی خۆی بۆ هەڵڕێژێت، چۆن چاوەکانی تێر لە بینینی تێر بکات، ئەویش وەها لەگەڵ هەڵدانەوەی ئەلبوومەکاندا ڕۆژگار و یادەوەرییەکانی بیردەهاتەوە و بۆی دەسووتا، هەستی بە خاتوون دەکرد، وا لە ماڵەکەدا بەرانبەر ئەو وێستاوە و سەرەدیقانێی لێل دەکات و بە چاوی سۆزەوە تێی دەڕوانێت.

ڤێجا لە تەماشاکردنی وێنەکان بووەوە، هەستیکرد جارێکی دیکە خاتوون لە پێش چاوەکانیدا نەماو بزربوو، لەو دەمەدا ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد، کە بۆ دواجار خاتوون ماڵئاوایی لێکرد و لە ماڵەکە چووە دەرەوە و کوڕێکی تولاز ئەگەر منداڵیان هەبووایە

بەقەد کوڕی ئەوان بوو، دەرگەی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ کردەوە و بۆ هاوسەرگیری نوێ بەرێکەوتن و ئەویشیان بێ خاتوون بەجێهێشت و خستیانە ناو دەریای خەمان و تەمەنیان ڕزاندەوە.

لەودەمی دا خاتوون لە خەیاڵی ئومێددا بوو، بە کارمامزێکی کێوی لەو دەشت و دەرە ئەو و ڕێداری دووکانداری تەمەن بیست و دوو ساڵان، هەردووکیان بە دوای کەوتبوون، کێ بیگانێ ببێتە هی ئەو، لەم کێبەرکێیەدا ڕێداری دووکاندار زووتر پێی گەیشت و لە باوەشی کرد و ڕفاندی، چونکە ئەو لەسەر شنگ و تاقەت بوو، ئومێدیش بە ناوساڵ کەوتبوو، شنگ و تاقەتی جارانی نەمابوو، بە دۆڕاو مایەوە، بۆیە دوای لە دەستدانی خاتوون ئەویش بیری لە نەمانی خۆی کردەوە، چونکە دوای ئەو ژیان لە هەموو جوانییەکانی داماڵرا و مانەوەی جگە لە خەم و خەفەت و ئاخ بۆ هەڵڕشتن و فرمێسك بۆ ڕشتن هیچی دیکەی پێوە نەمابوو.

ئومێد نەیتوانی چی دیکە لە ژوورەکەی بمێنێتەوە، جارێکی دیکە هەستی خۆسڕینەوەی دوای خاتوون داگیری کردەوە، ئۆقرەی لێ بڕا، پێیەکانی نایە سەر پەیژە و گەڕایەوە سەربان، تەماشایەکی کۆڵانی کرد، لەو کاتەدا جەبار کێشکەی بینی،

کە عەرەبانەکەی ڕیشۆڵە فرۆشتنی لە ماڵەکەیاندا دەردەهێنا و دەیبرد بۆ بازاڕ، ئەو پیاوە ماڵیان بەرانبەر ماڵی نەسرینی خوشکی ئومێد بوو، کاری ڕیشۆڵە فرۆشتنی دەکرد لەناو بازاڕی شار، لە ئاقارەکانی دەوروبەری شاردا، بە هۆی دانانی تۆڕەوە سەتان ڕیشۆڵەی دەگرت و دوایی بە هۆی عارەبانەکەیەوە، کە لە چەشنی قەفەز چێی کردبوو، دەیبردە بازاڕ و خەڵك دەیانکڕی، هەندێکیش فرۆشیارانی کێشکەی کولاو لێیان دەکڕی، خەڵکیش هەبوو بۆ خێری خۆی پارەی چەند ڕیشۆڵەیەکی دەدا و بەرەڵلایان دەکردن.

لەو دەمەیدا، کە جەبار لە ماڵەوە هاتە دەرەوە و عەرەبانەکەی ڕاگرتبوو، هێشتە نەڕۆیشتبوو کوڕ و کچێك بەوێدا هاتن، پێدەچوو ئاشق و ماشوق بن، چەند چۆلەکەیەکیان لە جەبار کڕی و بەرەڵلای ئاسمانیان کردن، پێدەچوو بۆ بەرەکەتی بەیەکگەیشتنیان ئەم خێرە بکەن.

ئومێد تەماشای ئەو دیمەنەی دەکرد، کە ڕیشۆڵەکانی بینی، ئازادییان پێ بەخشرا و لە قەفەزەوە هێنرانە دەرەوە و توانیان هەوای ئازادی هەڵمژن، ئەو لەو دەمەدا ڕۆژی ئازادبوونی خۆی هاتەوە یاد لە زیندانی ئەبو غرێب، خۆی میناك ئەو ڕیشۆلانە

هاتە پێش چاو، کە جارێکی دیکە ژیانی پێ بەخشرایەوە و گەڕایەوە ناو ماڵەکەی و بە دیداری خاتوون گەیشتەوە و هاتەوە ناو نوێنێکی گەرم و گەڕایەوە باوەشی خاتوون و بووەوە کتێبفرۆشەکەی سەر شۆستەی بن دیواری دادگە و بووەوە ئومێد ڕەشپۆشەکەی جاران.

بیری کەوتەوە، دوای سێ ساڵان لە زینداندا، ڕۆژێکیان ئەو خەونەی هاتەدی، کە سێ ساڵ بوو خەونی پێوەدەدیت. نیوەڕۆیەکی ڕۆژی ١٩٧٧/٩/٦ میقدادی بێژەری تەلەڤیزیۆنی بەغدا، سەرنجی هەموو زیندانیانی بۆ هەواڵێك ڕاکێشا، کە دوای کەمێکی دیکە هەواڵێکی گرینگ ڕادەگەیەنن ئەویش بەیاننامەیەکی گرینگی حیزبی بەعس و شۆڕشی ١٧- ٣٠ی تەمموز بوو لەبارەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی.

ئیتر بۆ ماوەی یەك دەمژمێری ڕەبەق، ئەوانەی لە دەرەوەی هۆڵەکەش بوون، هاتنەوە ناو هۆڵەکە و هەموو زیندانییەکان لە بەرانبەر ئەم هەواڵە و بەیاننامەیەدا مۆلەق وەستابوون و متاقیان لە خۆیان بڕیبوو، بە پەرۆشەوە چاوەڕوانی خوێندنەوەی بوون، ئاخۆ دەبێ چی تێدا بێت بۆ کورد، ئەوانیش بە دوای چارەنووسێکی خۆیان و میللەتەکەیان بوون، کە چییان بەسەردێت و دەبێت بەیاننامەکە لەبارەی

ناوچەی ئۆتۆنۆمی چی بێت و بۆ ئەوان چی دەبێت. بەیاننامەکەی خوێندەوە و لێبووردنی گشتیی ڕاگەیەندرا، لە هەموو بەش و هۆڵەکانی ناو زیندانی ئەبو غرێبدا، بوو بە چەپڵە و فیکەلێدان و هات و هاواری شادی، ئەو کاتە بۆ ئومێد لەم چرکەساتەدا خۆشترین شت بوو، کە لە ژیانیدا زۆر پێی دڵشاد بوو، زیندانیانی دیکەیش بە هەمان شێوە، هەستیان کرد، کە جارێکی دیکە لە دایك دەبنەوە و وەك مرۆڤ دەبنەوە کەسی ئاسایی ناو کۆمەڵگە و چیتر خاتوون و نەسرینی خوشکی و دلاوەر و کاوە و خزم و کەسوکار و برادەرانی دیکەی ئەو ڕێگە دووره نابڕن، ئیدی ئەوان خواردن نابەنە زیندان و لە کاتی چوونە ژوورەوەدا ناکەونە بن دەست و پێیان. ئومێد هەستی بە یەکگەیشتنەوەی بە خاتوون، لە هەموو شتێك خۆشتر بوو، چونکە دیسانەوە وەك ئومێد ڕەشپۆشی شاعیر دەبێتەوە کتێبفرۆشەکەی بن دیواری دادگە و پیاسەی شەقام و کۆڵان و سەردانی هاوڕێ و ماڵە خزمان دەکات و بەسەر قەڵات دەکەوێت و بەناو قەیسەری و بازاڕدا دەسووڕێتەوە، تەنانەت بۆ شارەکانی دیکەی کوردستان و بەغدا و شارەکانی دیکەی عێراقدا بە سەربەستی دێت و دەچێت و کەس ناتوانێت ڕێی لێ بگرێت

و دیوارەکانی زیندان نابنە بەربەست، هەر بۆیە جارێکی دیکە هەوای ئازادی هەڵدەمژێت و دەبێتەوە مرۆڤە سادەکەی جاران و کوڕی ئەم شارە و لێرە بەولاوە بەیانیان و ئێواران وەك ئاژەڵ ناژمێردرێن و دەکەوێتەوە ناو ئاو و هەوا و هەناسەی دەرەوەی زیندان.

ئەو ڕۆژە هەموو کوردانی ناو زیندان بوو بە جەژنیان و پیرۆزباییان لە یەکدی دەکرد. هەمووان وایاندەزانی بەربوونە تا لە بەیانییەکی ڕۆژی ١٩٨٧/٩/١٤ یەك یەك ناوەکان بە هۆی خۆفکەکانەوە خوێندرانەوە و دەیانبردن بۆ ژووری کاربگێڕی و پەنجەمۆریان پێدەکردن و خۆیان و پریاسکەیان ڕەوانەی دەرەوەی زیندان دەکران.

ئێوارەکەی ناوی ئومێد خوێندرایەوە و لە دەروازەی سەرەکیی گرتیگەدا، گەیشتە سەر شەقامی ئەبوغرێب، دوا ئاوڕی ماڵئاوایی لە زیندان دایەوە و نەفرەتی لەو ڕۆژ و شەوانە کرد، کە سێ ساڵ تیایدا لەناو ئەم تەلبەندە سەخت و بڵندانەدا ژیانی گوزەراندووە، ڤێجا بە دڵخۆشییەوە پشتی خۆی کردە زیندانەکە و نەیویست جارێکی دیکە بیبینێتەوە. کە هاتە دەرەوە بینی، خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ و دوو دوو و سێ سێ چاوەڕوانی زیندانکراوی خۆیان

دەکرد، ئەویش کە گەیشتە ناو دار خوارماکان بەرانبەر دەروازەی زیندان، خاتوون و نەسرین و دلاوەری بینی، بە خۆشییەوە بە پیرییەوە هاتن و باوەشی بە هەموویاندا وەرێنا و بێشەرم بۆ ماوەی پێنج چرکە خاتوونی لە باوەشکرد و وەك شێت ماچی کرد و بەری نەدەدا، تا دوایی لە شەرمی نەسرین و دلاوەر بەری دا.

ئەو جلەی بۆیان هێنابوو وەریگرت و خۆی گۆڕی و جلی زیندانی فڕێدا و سواری ئۆتۆمبێلەکەی دلاوەر بوون، بەلام لە بیریان چووبوو پێلاوی بۆ بێنن، هەر نەعلەکەی زیندانی لەپێ بوو، تا گەیشتنە بازێڕی خورماتوو، لەوێندەر هەم بۆ پشوو و نانخواردن لایاندایە چێشتخانەیەك و نانیان خوارد، دواتریش لە دووکانێکی بازاڕی ئەوێ پێلاوێکیان بۆ کڕی و کەوتنەڕێ.

ئەو ڕۆژە ئومێد وایدەزانی منداڵێکی ساوایە و تازە هاتووەتە ناو دنیا، ئیدی وەك ئەوەی دار و دیوار و شەقام و دەشت و چۆڵ و چیا و خانوو و ئاسمانی نەدیبێت، وەك ئەوەی یەکێك شتێکی ون کردبێت و دوایی بیدۆزێتەوە، یان میناك شەیدایەك تەماشای شەقام و دار و بەرد و دووکان و دەشت و دەر و چیا و ئاسمان و هەموو چتێکی ئەو دنیایەی دەکرد، چەندی

دەکرد لێیان تێر نەدەبوو. چەندی دەکرد چاوەکانی لە تەماشاکردنی سروشت و جوانییەکانی دنیا تێر نەدەبوو، هەستی لە بینینی چتەکان ڕوانینەکانی نەدەوەستاند.

وەك نامۆیەك تەماشای شتەکان و دەوروبەری خۆی دەکرد، هەستی بەوەکرد، کە ئیدی ئەوە ئومێد ڕەشپۆشە، وا دنیای ڕەشی بۆ کراوەتە ڕەنگی سپی و پەمبە، ئەمجارە بە چەشنێکی دیکە و بە جۆرێکی دیکە دنیا دەبینێت، کە لەگەڵ پێشتر جیاوازبوو.

ئومێد دوای ئەوەی پازدە ڕۆژان لەماڵەوە بەخێرهاتنی دەرو دراوسێ و میوانانی کرد، ئیدی ڕێوڕەسمی هاتنەوەش بەکۆتا هات، بووەوە کتێبفرۆشەکەی جارانی بن دیواری دادگە و جێگەی خۆی وەرگرتەوە و تا ئەو دەمەی خاتوون لێی جیابووەوە ئەویش هێشتە هەر کتێبفرۆش بوو.

(٨)

ئومێد هێشتاکە لە سەربانی ماڵی نەسرینی خوشکی بوو، بیرۆکەی خۆکوشتن بیر و هزرانی داگیرکردبوو، وەلێ جارێك لێل یادەوەرییەکاندا دەژیا، نەیاندەهێشت بگاتە خاڵی بەکۆتاهاتن، جار جارە دەگەیشتە دۆخی وێستانی کات، بەڵام برووسکەی یادەوەرییەکی تاڵی دیکە، لە چەخماخەی دەدا و لەو بارە دایدەبڕی و لە فەنا بوون دووری دەخستەوە.

ئەو ڕابردووی لێ بوو بوو بە مۆتەکە و هەرگیز بەرۆکی بەرنەدەدا، بۆیە دیمەن دوای دیمەن وەك پانۆرامای پچڕ پچڕ، هەر جارەی بۆ لایەك و بابەتێك خۆیان لەپێش چاویدا نمایش دەکرد و لە خۆ کوشتن دوایان دەخست.

ئەمجارە چۆلەکەی بیری بۆ لای دەفتەری یاداشتەکانی چیاد هەڵفڕی. ئەو دەفتەرەی کە یاداشتنامەی ئەوی تێدا نووسرابوو، کاتێك چیاد ویستی بیکوژێت و نەیتوانی و

بورایەوە، پاشان کە لەجیاتی ئومێد کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا، لە دەستی بەربووەوە، ئومێدیش هەڵیگرتەوە و بردی، ڕاستییەکەشی ئەوەبوو، کە ئەو خۆی بۆ ئەوەی هێنابوو تا دوای خۆی لای ئومێد بێت و بیپارێزێت و لە نهێنییەکانی ژیانی ئەو بکات.

ئەو ڕۆژە نەسرین و مێردی لەماڵ نەبوون، کش و ماتی ماڵەکەش لەبار بوو، کە ئومێد وەك چۆنی دەوێت بەو جۆرە ڕەفتار بکات و کەسێك نەبێت ئەو ڕێگەیەی لێبگرێت، کە ئەو بۆی دەچوو، یان لەو بیرۆکەیە پەژیوانی بکاتەوە، کە ئەو بیری لێدەکردەوە.

حەزی کرد پێش ئەوەی بکاتە دنیاکەی دیکە جارێکی دیکە، چەند لاپەڕەیەکی یاداشتەکەی چیاد بخوێنێتەوە، کە ڕاسپاردەی ماڵی خوشکی دابوو، ئاگەداری کردبوونەوە، کە ئەگەر هەموو کتێبەکانیشی تێدا بچن دەبێت ئەو دەفتەرە بپارێزن، نەسرینیش پاراستی و بەرگێکی جوانیشی لە دەفتەرەکە گرتبوو.

نها وا دەیخوێنێتەوە، حەزدەکات لاپەڕەکانی ئەم یاداشتنامە، دوا وێستگەی مانەوەی بن لەگەڵ ژیاندا، تاوەکوو هەموو یادەوەرییەکانی لە هزری خۆیدا بوەستێنێت، ئەوسا دەکاتە کاتژمێر سفری ژیان، ئیدی هەموو یادەوەرییەکان بە تاڵ و شیرینیانەوە، بە

هەوراز و نشێویانەوە، بە یادەوەرییەکانی چیادیشەوە لەگەڵ خۆی بباتە ناو گۆڕێکی تاریک و نووتەک، کە ئەو دوای لەدەستدانی خاتوون ئەوێی لە هۆش و هزری خۆیدا بە ماڵی داهاتووی خۆی دانابوو، بە شوێنی ڕەوای خۆیشی دەزانی، بەڵام وا دەفتەری یاداشتنامەکەی چیاد لە پرۆسەی چوونە ناو ئەو دنیایە و ئەو مەبەستەی دوورخستەوە.

لەگەڵ هەموو لاپەڕەیەکی یاداشتنامەکەدا ڕۆندکی خۆزگەیەك دەکەوتە سەر لاپەڕەکە و ئەوەی دەخواست، کە دەبووایە چیاد بکوژ و ئەویش کوژراوەکە بووایە، نەوەك بکەوێتە ئەو ڕۆژەی لە تاوی ئەڤینی خاتوون بگاتە ئەو چرکەساتانەی، کە بیری لێ دەکاتەوە و بۆی هاتووەتە سەربان، کە هێشتاکە یادەوەرییەکان بە تایبەتیش یادی ڕۆژانی ڕابردووی لەگەڵ چیاد و ئەم یاداشتانەی ئەو کە دەیانخوێنێتەوە ناهێڵن بگاتە کاتژمێر سفر، لەگەڵ ئەمەش بە سۆز و گریانەوە، بە بەزمیی پێداهاتنەوەی ڕۆشنبیرێك کە جیاوازی نەبوو، لەوەی ناوی چیاد بێت، یان عەباس ئەلسولتانی، ئەو پیاوەش دواجار ڕاستگۆیی و کاریگەری ڕۆشنبیری و کوێرەوەری خۆی لەگەڵ ژیاندا، وەك مرۆڤێکی نەمر و بە ویژدان لای ئومێد تۆمار کرد، لە کۆتایی وێستگەکانی ژیانیدا

بیرەوەرییەکانی دوا بیرهاتنەوەکانی بن.
بە داڕووخانێکی دەروونییەوە، بە هەڵڕشتنی فرمێسك و یادی ئەو پیاوە و بە دەستێکی لەرزۆکەوە لاپەڕەی چەند یادەوەرییەکی هەڵدایەوە:

١- ١- ١٩٨٩

ئەمڕۆ یەکەمین ڕۆژی سەری ساڵی نوێیە، خەڵکی هەموو لاپەڕەیەکی نوێ، لە ساڵێکی نوێدا لە ژیانیاندا هەڵدەدەنەوە.
منیش ئەو ڕۆژە نوێیە دەکەم بە دەرفەت، تاوەکوو دەست بە نووسینی یاداشتەکانی ژیانم بکەم، ئەمەش ئومێدی کتێبفرۆش فێری کردم و هانیدام.
بۆ ئەوەی بکارام ژیاننامەی خۆم بنووسم، چەندان کتێبی یاداشتنامە و یادەوەریم خوێندەوە، تاوەکوو واملێهات منیش لاپەڕەکانی ڕابردووی ژیانم هەڵدەمەوە و یاداشتیان بکەم.
هێندەی دەرفەت هەبێت و هزرم یارمەتیم بدات دەنووسم.
لە دەسپێکدا ناساندنی خۆمەوە دەست پێدەکەم:
من ناوم (چیاد عوکلە خلەیف ئەللهێبی)یە و بە ڕەگەز عارەبم و خەڵکی مەخموورم، وەلێ زمانی کوردی بە نووسین و خوێندنەوە دەزانم. ئێمە لەم شارەدا لەگەڵ

کوردان پێکڤە ژیاوین، بۆیە بە سانایی زمانی ئەوان فێر بووم، سەبارەت بە خوێندنەوە و نووسینیش، ئەوا دائیرەی ئەمن فێریان کردم، ئەو دەمەی لە مەخمووڕەوە گوێزرامەوە بۆ هەولێر، ئەوان بۆ کاری چاودێریکردنی کتێبخانە و کتێبفرۆشان خستمیانە خولێکی بەهێزکردنی فێربوونی نووسینی زمانی کوردی.

وردە وردە خوێندنەوەی کوردیم بەهێزتر دەبوو، دوای خولەکەش ئەوەی پتر ڕژدی کردم لەسەر پتر خوێندنەوەی کتێبی کوردی و زۆر هانیدام و وایکرد یاداشتنامەکەم بە کوردی بنووسم ئومێد ڕەشپۆشی کتێبفرۆش بوو، ک خۆی شاعیر و ڕۆشنبیرێکی بە توانە، بۆیە وا لەم یاداشتنامەیەمدا بە زمانی زکماکی خۆم نانووسم، تاوەکوو خوێنەران، یاخۆ ئەو کەسانەی دوای من، ئەم یاداشتنامەی من دەخوێننەوە، بزانن ئەدەب و ڕۆشنبیری، منی لە مرۆڤێکی ڕەگەزپەرستی تاوەکوو سەر ئێسقان، دژ بە کورد، کردە کەسێك لە پێناو هەستی بە مرۆ بوونەوە، خۆم پاك بکەمەوە و بە زمانی براکانم بنووسم.

* * *

ئومێد کە ئەو لاپەڕەیەی خوێندەوە، سۆز و خۆشەویستی و لە دەستدانی چیاد، یان عەباس ئەلسولتانی هاوڕێی، هەراسانیان کرد و بە کوڵ بۆی دەگریا، لەبەر خوای گەورە دەپاڕایەوە، کە بە گەورەیی خۆی بیبەخشێت، بەم هەستی مرۆڤایەتییەوەی، کە هەیبوو بیخاتە بەهەشتی خۆی و ئارامیش بە کەسوکارەکەی ببەخشێت.

هەرچەندە دەیزانی ئەو لە کەسوکارەکەی جیاواز بوو، ئەوان وەك ئەو نین، بەڵام بۆ ئەو لەم بیرهاتنەوەدا، کە خۆی وا خەریکە بە شوێنی ئەودا دەڕوات و نایەوێت لەسەر دنیادا بمێنێت، تەنیا نزا و بیرهاتنەوە و یادکردنەوەیەکی جوان، دەکارێت سۆزێك بخاتە دڵی و خۆزگەی ئەوەش بخوازێت، بەڵکو لە دنیاکەی دیکەدا خودای دەهندە و دلۆڤان بە یەکدییان شاد بکاتەوە.

٢- ١- ١٩٨٩

خۆڤەی هاوسەرم حەزی کرد، سەر لە کەسوکارمان بدەین و بچینەوە مەخموور، منیش ئەو ڕۆژە چوومە دەوام و سێ ڕۆژ مۆڵەتم وەرگرت، تاوەکوو سێ ڕۆژان بچینەوە ناو خزمان.

ئەو سەفەرەم زۆر پێخۆش بوو، هیچ نەبێت بە هۆی

سەردانی ماڵی خەڵەفی ئامۆزام، خۆشەویستەکەم دەبینم، کە هێشتاکە یەکدیمان خۆشدەوێت و بە هۆی نەریتی عەشیرەتگەرییەوە لە یەکدی دابڕاین، دوای ئەوەی جاسمی برام، کە ئەفسەر بوو، لە شەڕی عێراق- ئێران دەبێتە شەهیدی قادسیەی سەدام، بەو هۆیەشەوە من لە عومیشەی خۆم دادەبڕن و بە تۆبزی خۆفەی برازنم، لە من مارە دەکەن و دەبم بە مام و باوکی دوو کوڕ و کچێك.

لەبەرئەوەی نەریتی عەشیرەت بوون نەمتوانی لێی دەرباز بم، بۆیە من وەك هاوسەر تەماشای خۆفەم نەدەکرد، هەموو جار کە دەچووم سەرجێیم لەگەڵدا دەکرد، جاسمی برام دەهاتەوە پێش چاو و لێی دوور دەکەوتمەوە، بۆیە تا هەنووکەش منداڵم لێی نەبووە، نها دڵی من هەر لای عومیشەی خۆشەویستمە، کە دوای ئەوەی لە منیان دابڕی، بێ ویستی خۆی کردیانە هاوسەری خەڵەفی ئامۆزام.

ئەوەتانێ ئەم چیرۆکەی من درێژە و خۆزیا ئومێد ڕەشپۆش، ڕۆماننووس، یان چیرۆکنووس دەبوو، تا ئەم هەموو کارەساتانەی ژیانی منی بکردبووایە ڕۆمانێك.

ئەو ڕۆژە ئێوارەکەی، وەك هەموو ڕۆژانی دیکە چوومە بازاڕ و سەردانی کتێبخانەکانم کرد، یەکە یەکە کتێبفرۆشانم بەسەر کردەوە، بەڵام پتر لای ئومێد

گیرسامەوە، گوتووێژێکی درێژمان کرد، لەبارەی شیعری کوردی، ئەویش ئەم کتێبە نوێیانەی بۆ دانابووم، کە تازە چاپکرابوون و هەموویانم کڕی، دواتر گەڕامەوەماڵەوە، تا خۆمان بۆ سەفەری سبەی بۆ مەخموور ئامادە بکەین.
ئەو ڕۆژە زۆر دڵم خۆش بوو، چونکە سبەی دەچمەوە شارەکەی خۆم و خۆشەویستەکەی خۆم دەبینم و بە دیداری دایك و بابم و کەسوکارم شاد دەبمەوە.

٣- ١- ١٩٨٩

لە مەخموور لە ماڵی بابم بووین، منداڵەکان دڵیان خۆش بوو، خۆفەش هەر دڵی خۆش بوو. زیادی براشم، کە مفەوەز ئەمن بوو لە موسڵ هاتبووەوە. بابم چاوەڕوانی ئێمەی دەکرد، تاوەکوو هەموومان بچینە گوندی (گوبیبە) کە نزیك مەخموور بوو، ماڵی ئامۆزایەکی باوکم لەوێندەر بوو ناوی شەهاب بوو. خەڵکی ئەم گوندە هەموو لە عەشیرەتی خۆمان بوون.
بابم لەبارەی شەهاب دەیگوت:
کاتی خۆی بابی ژنی لەم گوندە بۆی هێناوە، دواتر ماڵی خەزووری تەنیا ئەو کچەیان هەبووە و حەزیان کردووە کچەکەیان لەوان دوور نەکەوێتەوە، بۆیە لەوێندەر زەوی دەدەنە شەهاب و بە گەلەکۆمەکی

خەڵكی گوندیش خانووی بۆ چێ دەكەن و لەوێ دەگیرسێتەوە.
شەهاب سێ كیژ و دوو كوڕی هەبوو، بابیشم حەزی دەكرد تێكەڵ ببنەوە، شەهابیش پێی خۆش بوو، بۆیە بە خۆی داوا لە بابم دەكات خزمایەتییان نوێ بكەنەوە، لە خێزانی ئێمەش تەنیا زیادی برام ژنی نەهێنابوو، بۆیە ئەو تێكەڵبوونەوەی پێ باش بوو.
زیاد لە موسڵ حەزی لە كچێكی كریستیان دەكرد ناوی مریەم بوو، ئەوان لە بەرتلەوە لەبەر بێكاری هاتبوونە موسڵ لە گەڕەكی (مەیدان) دەژیان، بابی مریەم ناوی عامر بوو، خزمێكی بازرگانی هەبوو لەناو بازاڕی موسڵ دووكانی لە باب ئەلسەرای- بازاڕگەی ئەلقەمەرییە، ناوی مەنهەل بوو، ئەو پیاوە بازرگانە پیكابێكی بۆ بابی مریەم كڕیبوو، تاوەكوو بە هاوبەشی كاری پێبكات و كەلوپەلی بۆ هەولێر و دهۆك و دەوروبەری موسڵ پێ دەگواستەوە.
زیاد ئەو چیرۆكەی تەنیا لای من دركاندبوو، چونكە نەیدەوێرا لای باوكم و دایكم و كەسی دیكە باسی بكات، چونكە لە نەریتی عەشیرەتگەری ئێمەدا، ئەوە ئەستەم بوو، كە كچێكی كریستیان بخوازن، ڕەنگە كەسوكاری مریەمیش هەر كچەیان نەدابووایە، بۆیە كە بینیم زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوو،

نەیدەزانـی چـۆن دایـك و بـاوكـم و كـەسـوكـارم تـێ بـگـەیێنێـت و بێـژێ: ئـەز نـاخـوازم هـاوسـەرگـیری لەگـەڵ عەمشـەی كـچـی شـەهابی ئامـۆزای بابـم بـكـەم.

منیـش سـەرم لـێ سـوورِما بـوو، لەلایـەك دەمویسـت زیـاد بـەوە ڕازی بـكـەم، كـە واز لـەو كـچـە كـریستیانە بێنێـت، لـە لایەكیـش نەمدەزانـی ئەگـەر ئـەو نەیتوانـی واز لـەو ئەشـقەی بێنێـت چـۆن دەتوانێـت بابـم و دایكـم ڕازی بـكـەیـن.

ئـەو خـەمـە بـوو بـوو بـە خـەمـی مـن، چونكـە مـن دوای جاسـمی بـرام بووبـووم بـە بـرا گـەورە و كـەوتبوومـە نێـوان دوو بـەرداش.

زیـاد زۆر خـەمبـار بـوو، پێكـڤـە چووینـە دەرمـوەی مـەخمـوور، بـۆ ئـەوەی تۆزێـك قسـان بـكـەیـن، ئـەو سـەر گـۆڕی جاسـمی پـێ بـاش بـوو، تـا بچیـن فاتیحـایـەكـی بـۆ بخوێنیـن و هـەمیـش دڵـی خـۆی بـۆ مـن بـكـاتـەوە.

ئـەو ڕۆژە چووینـە سـەر گـۆڕی جاسـم، مـن دڵـم زۆر نـاخـۆش بـوو، چونكـە لـە هـەمـوو كـەس باشـتر دەمزانـی دەردی دەسـت لێكبـەردانـی دوو ئاشـق چـەنـد سـەختە، ئـەوە نییـە منیـش هێشـتاكە نەمتوانیـوە ئیشـقی عومیشـە لـە دڵـی خۆمـدا بسـڕمەوە، بۆیـە سـۆزێكـم بـۆ زیـاد هەبـوو، چـۆن دەتوانێـت دەسـتبەرداری مریـەم بێـت، بـا لەسـەر ئاییـنی جیاوازیـش بـن، خـۆ ئەگـەر كـەسـوكـاری هـەردوولامـان

ڕازی بن، ئەوا هەر کەسەیان لەسەر دینی خۆیان مارە دەکرێن و دەتوانن ببن بە هاوسەر، بەڵام ئەوەش دەزانم، کە ئەو کارە زۆر سەختە، چونکە بابم هەرێی بە شەهابی ئامۆزای دابوو.

شەو کە لەگەڵ زیاد لە ژوورێکدا پێکەوە بووین، هەستم دەکرد هەردووکمان تا سپێدەی بەیان خۆمان هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکرد و خەو نەدەچووە چاوەکانمان.

ئەو شەوە تا کازیوەی بەیان، هزر و هۆشم هەر لای زیاد بوو، چۆن و بە چ ڕێگەیەك چارەسەر دەبێت، هەروەك چۆن دەشمزانی و لەوە دڵنیا بووم، کە کۆتایی ئەڤیندارییەکەیان وەك ئیشقی من و عومیشە بە خواستی ئێمە و ئەوانیش نابێت و لەبار دەچێت.

٤- ١- ١٩٨٩

لە مەخموور بووم، بەیانی، کە لە خەو ڕابووم، من و زیاد باوێشکمان دەدا.

بابم خۆی بۆ ئاهەنگی زیاد و عەمشە ئامادە دەکرد و خزمانی تێ گەیاندبوو، تاوەکوو لە ماڵی باوکم گردببنەوە و بچینە داخوازی بووکەکەی زیاد، لە شەهابی ئامۆزای.

بابم بۆ پاداشتی شەهیدانەی جاسمی برام، پارچە

زوییەکی لە گەڕەکی سەربازی مەخموور وەرگرتبوو، کە دەیاندایە شەهیدانی قادسیە، لەگەڵ ئۆتۆمبێلێکی نوێ لە کۆمپانیای گشتیی ئۆتۆمبێلدا. بابم دەیویست خانوویەك لەسەر زەوییەکە بۆ زیاد چێ بکات، تاوەکوو ژنەکەی تێدا بگوازێتەوە و ئۆتۆمبێلەکەشی بێ پرسی من و خۆفەی هاوسەرم، کە پێشتر هاسەری جاسمی برام بوو، دابوو بە زیاد، هەرچەندە ئەو وەرینەگرتبوو و پێی وتبوو: ئەوە مافی چیاد و خۆفەیە، کە ئەوان میراتگری خاوەن هەقی ئەون، بەڵام بابم پێی وتبوو: کە چیاد ئۆتۆمبێلی خۆی هەیە، خۆفەش نایەوێت وەریبگرێت، بۆیە بە خورتی دابووی بە زیاد، ئەویش نەیدەتوانی قسەی بابم بشکێنێت، ئێمەش هەموومان هەر نەماندەتوانی قسە لە قسەی بابم بکەین.

ئاخر نەریتی عەشیرەتگەری ئێمە وابوو، عەشیرەتی ئێمە لهێب کەس نەبوو قسە لە قسەی بابم بکات و ڕەتی بکاتەوە، چونکە دوای مردنی شێخ مەسحول بابمیان کردبوو بە شێخی عەشیرەت و برا گەورەی هەمووان.

هەر ئەمڕۆ دوای نیوەڕۆ، من و زیاد لەگەڵ یەکدی دەردە دڵمان کرد، کە چۆن ئیشقی ئەو و مریەم بە بابم بڵێین، چونکە ڕازیبوونی بابم، واتە ڕازیبوونی دایکم

و هەموو کەسوکارم و عەشیرەتەکەشمان، بەڵام کێشەی سەرەکیمان ئەوەبوو، کە چۆن ئەو بوێرییە بدەینە خۆمان و بکارین بە بابم بڵێین: زیاد نایەوێت هاوسەرگیری لەگەڵ عەمشەی کچی شەهابی ئامۆزای ئەو بکات و کەسێکی دیکەی خۆشدەوێت کە کریستیانە وماڵیان لە موسڵە. دەبووایە بیرێکی قووڵی لێ بکەینەوە، کە چۆن پێی بڵێین.

دوای بیرکردنەوە و گوتووێژێکی زۆر لە نێوانماندا، هەردووکمان بوێری ئەوەمان نەبوو، ئەم بابەتە لای باوکمان بدرکێنین، بۆیە تاکە چارە هەر ئەوە بوو، یان دەبێت زیاد واز لە خۆشەویستەکەی بێنێت و بچێتە ژێر باری داواکاری بابم و عەمشە بکات بە هاوسەری خۆی، یاخۆ کە گەڕایەوە موسڵ چیدی نەگەڕێتەوە مەخموور و مریەم بخوازێت، ئەوسا ئەوانیش هەم لەبەر جیاوازی ئایین، هەمیش بێ چوونی کەسوکاری زیاد بۆ داخوازی ئەو کچەی پێنادەن و ڕەتی دەکەنەوە.

چارەی دیکەیش ئەوە بوو، کە خۆی و مریەم بۆ شارێکی دیکە سەرهەڵبگرن و کەس نەیانبینێتەوە. ئێمە لەگەڵ زیاد بیرمان لە هەموو چتێک کردەوە، ئەم ڕێگەیەش ئاسان نەبوو، چونکە زیاد کەسێکی ئاسایی نەبوو، تاوەکوو ئەم کارە بکات و لە چاوان ون بێت، ئەو مفەوەزی ئەمن بوو لە موسڵ، بۆیە ئەگەر بۆ

هەر شارێکی دیکەی عێراقیش بچێت، بێگومان ئەوان بە ئاسانی دەیدۆزنەوە و ناتوانێت بە شاردراوەیی بژێت.
ئێمە هەموو چتێکمان لە پێش چاوان بوو، لە ئەنجامەکەیمان دەکۆڵییەوە، بەڵام دواجار هەموو ڕێگەکان لەبەر دەممانـدا دادەخران و لە جووڵەیان دەخستین.
لە دوا بیرکردنەوەمدا، توانیم جارێ لەم بارودۆخەدا زیاد بەوە ڕازی بکەم، وەك چۆن من نەمتوانی کۆتوبەندی عەشیرەتگەری لە دەستی خۆمدا بپچڕێنم و فەرمانی بابم جێبەجێ کرد و بێ عومیشە مامەوە، بە ناچاری خۆفەی برازنمیان کردە هاوسەرم و بوومە باوك و مامی دوو کوڕ و کچێك، ئاوەهاش زیاد ناتوانێت لەم کۆتوبەندە دەربازبێت، بە تایبەتی بابم لەم هاوسەرگیرییەدا لەگەڵ شەهابی ئامۆزای هەموو چتێکیان بڕاندبووەوە و بڕیاری ئەم هاوسەرگیرییەیان دابوو، ئەوەی پەلەشیان بوو ئەوەبوو، کە پێش تەواوبوونی مۆڵەتی من و زیاد، دەبووایە بچین داخوازی عەمشە بکەین.
زیادیش نەیتوانی ئەم کۆتوبەندە بپچڕێنێت، بۆیە بە ناچاری پێی لە جەرگی خۆی ناو بڕیاری دا، لەمەودوا نەچێتە سەر ڕێگەی قوتابخانەی ئامادەیی کچان، کە هەموو جار مریەمی لەوێ دەدیت و پێکەوە دەچوونە

دەرەوەی شاری موسڵ و دوایی دەیبردوە گەڕەکی خۆیان و ئەویش دەگەڕایەوە شوقەکەی خۆی لە گەڕەکی ئەلزهوردا.

ئێوارە زۆر بیری عومیشەم دەکرد، بە تەنیا چوومە سەردانی ماڵی خەڵەفی ئامۆزام، بەڵام پەژیوان بوومەوە، کە چووم، خۆزیا بەم شێوەیە نەمدیبایە، جەرگی دەرهێنام، دوای ئەم هەموو چاوەڕوانی دیتنە و ئەم هەموو بیرکردنەی ئەو، بەڵام بە نەخۆشی بینیم بە دەم ئازارەوە دەتلایەوە، بە تیلەی چاوە ڕەشە گەورەکانی، تەماشای دەکردم، وەك ئەوەی جارێکی دیکە نەیبینمەوە چاوەکانی لەسەر من هەڵنەدەگرت.

هەستم بەوە کرد، بە هۆی سەختی نەخۆشییەکەیەوە نەیتوانی وەك جاران بە ڕوومدا پێبکەنێت، ئەمجارە وەك جاران بە ڕووخساری تژی لە خەندە و ڕووی خۆشەوە نەمبینی، بگرە ڕوانینەکانی خەمێکی شاراوەی قووڵیان دەدرکاند.

ئەمشەو لەبەر خەمی ئازارەکانی عومیشە، بە خەمبارییەوە گەڕامەوە ماڵی بابم.

شەو تاوەکوو سپێدە خەو لە چاوانمدا تۆرا و کێشەی زیادم لەبیر کرد و هزر و هۆشم هەر لای عومیشە بوو، هەستم دەکرد ئەوە دوا بینینی ئەو بێت و جارێکی دیکە نایبینمەوە.

٥- ١- ١٩٨٩

ئەورۆ من بە خەمی عومیشەوە ئۆقرەم لەبەر بڕابوو، زیادیش بە خەمی دەستبەرداربوون لە ئیشقەکەی، لەگەڵ کەسوکار و خزمان کۆبووینەوە و چەند پیکابێك لە هی خۆمان و خزمان بەڕێکەوتین و چووینە گوندی گوبیبە.

لەویٚ ماڵی شەهاب خۆیان بۆ میوانداری ئامادە کردبوو، دراوسێیەکانیشیان هاتبوونە ماڵی ئەوان، بۆ ئێوارە خواردنێکی زۆریان ئامادە کردبوو. دوای نوێژی ئێوارە، شیف خوراو چایە خورایەوە.

بابم داوای نوێکردنەوەی خزمایەتی، لە شەهابی ئامۆزای کرد، ئەویش عەمشەی کچی بەپێی شەرعی خوا و پێغەمبەر پێشکێش بە زیادی برام کرد.

هەموو لایەك یەکدیمان ماچ کرد، دوای مارەکردن زیاد دەستی خەزور و بابمی ماچ کرد و هەموو پیرۆزباییمان لێکرد.

ئەو شەوە هەموو لایەك دڵیان بە مارەیی زیاد و عەمشە خۆش بوو، تەنیا من و زیاد لە دڵدا هەرسان بووین.

بابم و فەتیمی دایکم و فەتونەی خوشکم، کە لە من و زیاد گەورەتر بوو، لە ڕەحمەتی جاسمی براشم بچووکتر بوو، هەموو خۆشحاڵ بوون. فەتونە لەبەر (فەتحی)ی مێردی کەوتبووە گوێر، دڵخۆش دیار

بوون.

ژنەکان هەموو خۆیان ڕازاندبوومەوە، پیاوانیش هەموو جلی نوێ و خاوێنیان لەبەر کردبوو.

من و زیاد ئەگەرچی بە جلوبەرگیش خۆمان پۆشتە کردبوو، بەڵام زۆر خەمبار بووین. ئەو لەبەر مریەم، منیش لەبەر سەختی نەخۆشییەکەی عومیشە پتر پەرێشان بووم، کە لەم ڕێوڕەسمەدا لەگەڵ خەڵەف جێیان ڤالا بوو.

شەو کە گەڕاینەوە ماڵەوە زیاد دڵی خۆی بۆ کردمەوە و پێی وتم:

ئەو میناك مردوویەك، لە شەوێکی زیندووی خۆیدا ڕەوتاری کردووە. ئەو بە جەستە لە ماڵی شەهاب و لەگەڵ عەمشە بووە، بەڵام دڵ و هزر و هۆشی لای مریەم بوو، لە هەموو ڕێوڕەسمەکەدا دیمەنی مریەمی لەبری وێنەی عەمشە لەپێش چاو بووە.

زۆر دڵی زیادم دایەوە و داوام لێکرد تازە دەبێت لەگەڵ ئەو ژیانە نوێیە و ئەو گۆڕانکارییەدا خۆی ڕابێنێت، هەرچەندە منیش، تاوەکوو ئەو چرکەساتەش وا یاداشتی ئەو ڕۆژانە دەنووسمەوە، نەمتوانیوە بۆ چاو تروکانێکیش چییە، وێنە و یادەوەری و یادگارییەکانی عومیشە لەپێش چاوانمدا دووربخەمەوە، چجای ئەوجارەی کە ئەوم زۆر بە کزی و شەکەتی بینی و هەستم بە

سەرنجەکان و تێڕوانینەکانی دەکرد بۆ من، ئەومم لە چاوەکانی دەخوێندەوە، کە ئەو تەماشاکردنانە هێمای خواحافیزی یەکجارەکین، لە من و ئیدی لەم ژیانە و دنیایەدا جارێکی دیکە یەکدی نابینینەوە.
شەو زوو نووستین، تاوەکوو بەیانی زوو بگەڕێمەوە بۆ هەولێر، زیادیش دەبووایە بەیانی بگەڕێتەوە دەوامی خۆی، تاوەکوو ئەویش بەیانی زوو بەڕێ بکەوێت.
قەڵەمەکەم دانا، نەمتوانی چیدی یاداشتی ئەم شەوە بنووسمەوە، چونکە قەڵەمیش هاوسۆز بوو لەگەڵ هەستی تژی جەخاری من.

٦- ١- ١٩٨٩

لە هەولێر بووم، سێ ڕۆژان بوو لەبەر مۆڵەت سەردانی کتێبخانە و کتێبفرۆشانم نەکردبوو، بە کردمنیش بیری هەندێکیانم دەکرد، بەتایبەتی ئومێد ڕەشپۆش، کە دەبووایە ئێواران جارێك بچمە لای، ڤێجا یەکە یەکە تاوێك لای ئەوانی دیکەیش بوەستم، هەوڵ بدەم کتێبێك بکڕم، لە کتێبخانەکان و لای کتێبفرۆشانیش هەست لە قسەی هاموشۆکەران و خوێنەرانی کتێب ڕابگرم و بزانم چی دەڵێن بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی خۆم بنووسم.
ئەوڕۆ لای پشتیوانی کتێبفرۆش ڕاوەستابووم، فەرمیدوونی

برای فریاد مەولانام بینی هاتە ئەوێ. چاك و چۆنیم لەگەڵیدا كرد، ئەو كاتی خۆی لەگەڵ فریادی برای لە نێزیك دادگە كتێبخانەیەكی گەورمیان هەبوو، خوێنەری زۆر و نووسەر و ڕۆشنبیران دەهاتنە كتێبخانەی (چیا)، كە فریاد بە ناوی كوڕەكەیەوەی كردبوو.

چیا لە قوتابخانەی سەرەتایی بوو، لەگەڵ باوكی دەهاتە كتێبخانە، زۆر لە خوێنەران و كڕیارانی كتێبخانەكەی باوكی دەناسی و ناوی دەزانین. فەرمیدوون و فریاد، جیا لەوەی كە كتێبفرۆش بوون خوێنەری زۆر چاكیش بوون، هەموو جۆرە كتێبێكی كوردی و عارەبییان هەبوو.

فەرمیدوون مامۆستا بوو، دانێك لە قوتابخانە بوو، دانێكیش لەگەڵ فریادی برای لە كتێبخانە بوو. دوای ئەوەی كتێبخانەی چیا داخرا، ئیدی جارێكی دیكە نەمبینینەوە، ئەگەرچی ئاگام لە گیرانەكەی بوو، بەڵام دوای ئەوە نەمزانی چارەنووسی بەچی گەیشت، بۆیە ئەو دەمەی لە كتێبفرۆشییەكەی پشتیوان، فەرمیدوونم بینی و بە شەرمەوە لە هەواڵ و چارەنووسی فریادی برایم پرسی، بەڵام ئەو كە ناوی فریادی برای هات، چاوەكانی پڕ بوون لە ڕۆندكان و بە ئاخ و حەسرەتەوە، وەك ئەوەی برینم كولاندبێتەوە

گوتی:

- عەباس ئەلسولْتانی، کاکم فریاد تۆی زۆر خۆشدەویست، ئێستەکەش ئەو ڕۆژانەم لە بیرە کە تۆ دەهاتییە کتێبخانەکەمان و کتێبت دەکڕی و گاڵتەشت لەگەڵ چیای برازام دەکرد، کاکیشم کتێبی دەگمەنی بۆ هەڵدەگرتی، ئای .. های .. دنیا بۆ کەس نامێنێت.

- بۆچی .. توخوا کاك فریاد چی لێهات، ناکا بڵێی لە دنیادا نەماوە!

- نازانم بەسەرهاتی ئەوت زانی، یان نا؟

- کامە بەسەرهات؟

- ئەوەی کاتی خۆی لە دائیرەی ئەمن هاتن گرتیان، چونکە ڕاپۆرتی لەبارەوە نووسرابوو.

منیش خۆم لەم بابەتە نەبان کرد، گوایە ئاگام لە هیچ نییە، کەچی دەشمزانی ئەو پیاوە بە ڕاپۆرتی من گیرا و حەواڵەی دادگەیان کرد و کەوتە ئەبوغرێب، بەڵام دوای ئەوە نەمزانی چی لێبەسەر هات، کەچی من بە فەرمیدوونم گوت: هیچی لێ نازانم.

ئەویش چیرۆکی فریادی برای وەها بۆ گێڕامەوە و وتی:

- ڕۆژێکیان لە کتێبخانە بووین، هاتن و بردیان بۆ دائیرەی ئەمنی هەولێر، لەوێندەر سەردانی نەبوو،

دوایـی ڕەوانـەی دادگـەیـان کـرد و بـە پـازدە سـاڵ زیندانـی حوکـم درا و نێردرایـە گرتیگەهـی ئەبوغرێـب و کەوتـە بەشـی حوکمـە تایبەتییـەکان. دوای سـاڵێك لـە زینـدان لـە ڕۆژی لەدایکبوونـی سـەرۆکی فەرمانـدەی عێـراق بـەر لێبـووردن کـەوت و هاتـەوە هەولێـر.

دوای گیرانـی کاکـم دائیـرەی ئەمـن ناچـاری کـردیـن کتێبخانەکـە دابخەیـن، کاکـم کـە بەربـوو لەبەرئـەوەی سـەر بـە ڕێکخسـتنی نهێنـی حیزبێکـی کـوردی بـوو، لـە زیندانیش زیاتر بە بیروباوەڕی کوردایەتی و شۆڕشگێڕی لەگـەڵ نووسـەر و ئەدیبانـی کـورد پـەروەردە کرابـوو، نەیانهێشـت جارێکـی دیکـە کتێبخانەکـە بکاتـەوە، ئەویـش نەیتوانـی چـی دیکـە بمێنێتـەوە.

- ئەدی چیکرد و چیلێهات؟

- ئەو دەمە ڕووی لە شاخ کرد و بوو بە پێشمەرگە.

- ئێستە لە ژیاندایە؟

- نەخێـر، خـوا لێـی خـۆش بێـت، دوای چەنـد سـاڵێك پێشـمەرگایەتیی لـە شـەڕێکی دەسـتەویەخەدا لەگـەڵ جاشـەکان لـە بنـاری هەڵگـورد شـەهید بـوو.

- ئۆو خۆزیـا نەمزانیبـا، یـادی بەخێـر، گیانـی شـاد، جێـی بەهەشـتە.

لـە دڵـی خۆمـدا زۆر خەمـم بـۆی خـوارد و سـکم پێـی سـووتا، واشـم بیرکـردەوە ئەگـەر مامۆسـتا فەرمیـدوون

دەیزانی کاتی خۆی بە هۆی ڕاپۆرتی منەوە گەیشتوومتە ئەو چارەنووسە، منیش عەباس ئەلسولتانی خوێنەر و ڕۆشنبیر نیم، وەك ئەوەی تاوەکوو ئەو کاتەش ئەو هەر وایزانیوە، ئەوا ڕەوتارەکان و کاردانەوەی جۆرێکی دیکە دەبێت، بەڵام چاکە کە هەر لای ئەو عەباس ئەلسولتانییەکەی جارانم، کە هاتووچووی کتێبخانەکەی ئەوانم دەکرد. هەردووکمان برینەکانمان کولایەوە، ئەو بۆ بیرهاتنەوەی فریادی براکەی، منیش بە ئازاردانی ویژدانم، کە چۆن بە ڕاپۆرتی من کتێبخانەکەیم کوێر کرد و خێزانێکم بێ باوك هێشتەوە، بە تایبەتی چیا، کە کتێبخانەکە بە ناوی ئەوەوە بوو، ئەوسا کە دەهاتە کتێبخانە هێندە زیرەك و زرنگ بوو، ناوی هەموو نووسەر و کڕیارەکانی کتێبی دەزانی، کە بەردەوام هاموشۆی کتێبخانەیان دەکرد.

ئەو ڕۆژە هەرچەندە زۆر لە کتێبخانە و کتێبفرۆشانم بەسەر کردەوە، بەڵام بیر و هۆشم هەر لای کتێبخانەی چیا و فریادی ڕەحمەتی بوو، هەروەها مامۆستا فەرەیدوون و چیا کە هەمووان خۆشیان دەویستم و بە ڕۆشنبیرێکی عارەبی دژی حکوومەتەکەی سەدامیان دەزانیم و هەموو قسە و نهێنییەکانیان لای من دەدرکاند، نەشیانزانی شایانی پاراستنی ئەم

نهێنییانە نیم و ئەو عەباس ئەلسولّتانییە نیم کە ئەوان بە جۆرێکی دیکە وێنایان دەکردم.

٧- ١- ١٩٨٩

ئەورۆ ئەم ڕاپۆرتەم پێشکێش کرد، کە داوایان لێکردبووم، ناوی هەموو کتێبخانە و کتێبفرۆشان و شوێنیان و سەرپێبوونی سیاسییان بۆ بنووسم، ئەوەش هەفتەیەك پێوەی خەریك بووم، چونکە بە شێوەی مەیدانی و بە پرسیار، تاوەکوو توانیم ئەوەی دائیرەکەم لێی دەویستم بۆیان بنووسم.
بۆ کتێبخانە و کتێبفرۆشانی پێش هەشتاکانیش، لە چەندان کەسی بە تەمەن و خوێنەری نەوەی کۆن و چەند کتێبفرۆشێکی کۆنم پرسی، بەڵام بۆ کتێبخانە و کتێبفرۆشانی ساڵانی هەشتاکان زۆرینەی زانیارییەکانم لە بەسەرکردنەوەی بەردەوامی خۆم و زانینی ئومێد وەرگرت.
زانیم کە لە ساڵانی زووەوە چاپخانە و کتێبخانەی گیوی موکریانی هەبووە، بە ناوی چاپخانەی کوردستان، کە هەم کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاری چاپ کردووە، هەمیش چاپخانەکە لە دەرەوە بە پانی لایەکی چاپخانەکە جامخانەیەکی هەبووە، کە کتێبە چاپکراوەکانی چاپخانەی کوردستانی تێدا

نمایش کراوه بۆ فرۆشتن.
لە ساڵانی حەفتاکاندا چەندان کتێبخانەی دیکەیش هەبوونە لەوانە: کتێبخانەکانی خۆشناو و عەسکەری و سەربەستی و هەولێر و سەرکەوت و زەردەشت، کە هەندێك لەوانە لە ساڵانی شەستەکانیشدا هەبوونە، بەڵام کۆنترین کتێبخانە دوای چاپخانەی کوردستان لە هەولێر، ئەوا کتێبخانەی ئەربیل بووە، کە خاوەنەکەی شێخەشەل بووە، کە پیاوێکی شیوعی بووە و ئەم کتێبخانەیە لە ساڵی (١٩٤٥). بە دواوە هەبووە، دواتر نەماوە.
من لە ڕاپۆرتەکەمدا بە زانیاری وردەوە شوێن و کاتی دانان و داخستن و خاوەنەکانی ئەم کتێبخانانەم هەموو نووسیوە، بەڵام لێرە بە پێویستی نازانم هەموو شتێ لەم یاداشتنامەیەدا بنووسم. بۆ کتێبخانە و کتێبفرۆشانی ساڵانی هەشتاش، هەر بە هەمان شێوە بە زانیاریی تەواوەوە هەموویم نووسیوە، بەڵام من لەم یاداشتنامەیەدا تەنیا ناوی کتێبخانە و کتێبفرۆشان دەنووسم کە ئەوانە بوونە:
یەکەم: کتێبخانەکانی دەزگەی نیشتمانی بۆ بڵاوکردنەوە و دابەشکردن و ریکلام، خۆماڵی، حەیدەری، سۆلاف، هەژار، بێکەس، زانا، کۆسرەت، هاوڕێ، کریف، گەردی، جەباری، گۆران، لەگەڵ

چەند کتێبخانەیەکی دیکە لە نزیک دادگە و بەرانبەر دەرگەی پشتەوەی قەڵا و نزیک بگۆڕی هەولێر، کە ئەوانە کتێب و مەلزەمە و کتێبی قوتابخانەیان دەفرۆشت. لەگەڵ چەند کەسێك لەبن دیواری دادگە و بن دیواری قەڵات و گۆڕەپانی نزیك مزگەوتی شێخەڵڵا و دیواری باخی شاردا، کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەیان لەسەر زەوی ڕادەخست و دەفرۆشت، تەنیا هادی کتێبفرۆش نەبێت، کە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی لەسەر عەرەبانەیەکی درێژ دەفرۆشت و هەر جارەی لەلایەك دایدەنا.

لەم ڕاپۆرتەشدا کە نووسیم، هەر یەکێك لە خاوەنی کتێبخانەکان و کتێبفرۆشەکان مەیل و لایەنگیری هەمووانم نووسیبوو، چ ئەوانەی لایەنگیری حیزبەکانی شاخ بوون و چ ئەوانەش کە سەر بە حیزبی بەعس و دائیرەی ئەمن بوون، بەڵام من ئەو زانیارییانە ناتوانم لە یاداشتنامەدا بنووسم، چونکە بابەتی ئەمنییە و پێوەندیی بە ڕۆشنبیری و ئەدەبەوە نییە و ناشبێ خوێنەری یاداشتنامەکەم ئەم نهێنییانە بزانن و بە پێویستیشی نازانم، ئەوە بۆ من فەرمانێکی سەرووی خۆم بووە و جێبەجێم کردووە.

* * *

ئومێد زۆر بێزار بوو هەڵپەی ئەوەی بوو هەرچی زووە کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت، چی دیکە خاتوون بە هاوژین و خۆشەویستی کەسێکی دیکە نەبینێت، بەڵام ئەوە یادگاری و یادەوەرییە خۆش و ناخۆشەکانی ئەون، ئەوە ڕۆژانی ڕابردووی ئەون، کە لە یادگەیدا ناسڕێتەوە و بەرۆکی بەرنادەن و لە مێشکیدا یەکە یەکە دیمەنەکانی ڕابردووی دێننەوە پێش چاوی، بۆیە بۆ ئەوەی لە ئازاری خوێندنەوەی ئەم یاداشتنامەی چیادیش دەرباز بێت و بگاتە کاتژمێری سفری دابڕان لە ژیان و چوون بۆ دنیایەکی دیکە چەند ڕۆژانێکی لە لاپەڕەکانی یاداشتنامەکەدا هەڵدایەوە و بێتاقەت بوو، بەڵام دواجار لەم لاپەڕەیە گیرسایەوە، کە دوا لاپەڕەی یاداشتنامەکە بوو، باسی دوا چرکەکانی هاتنی چیاد بوو بۆ جێبەجێکردنی ڕاسپاردەکەی دائیرەی ئەمن و کۆتایی هێنان بە ژیانی ئومێد ڕەشپۆشی شاعیر و کتێبفرۆش.

ئەو لەوێ تەواو نهێنی و باری دەروونی چیادی بۆ ڕوونبووەوە، کە لە نێوان دوو گوشاردا بۆ کوشتنی هاتبوو، یەکێکیان دوای مردنی عومیشە، کە چیاد لە یاداشتنامەکەیدا ئەم هەواڵەی نووسیبوو، کە پێیان دابوو، بۆ پرسە گەڕایەوە مەخموور و سێ

ڕۆژان لە پرسەکەی وێستا و لە تۆماری ئەم ڕۆژەیدا ناوی خۆی وەك کەسێکی مردوو تۆمار کرد و بڕیاری ئەوەی دا، کە ئیدی ئەویش دوای عومیشە ناتوانێت بژی، بۆیە ئەم وردەکارییەی ئەم دوا لاپەڕەی بەوە لێکدایەوە و هەرواشی کرد، لەجیاتی ئەو بکوژێت کە بۆ ئەم مەبەستە نێردرابوو، ئەو خۆی گەیاندە لای عومیشەکەی، ئەمەش دوا لاپەڕەی یاداشتنامەکە بوو، دوا خوێندنەوەی ئومێدیش بوو، ئیتر ئەویش لەم چرکەساتەدا بووە ڕەشپۆشێکی دڵڕەشی ژیان و بڕیاری دا، وەك چیاد بۆ خۆشەویستییەکەی و ئەوینەکەی بە وەفا بێت. ئومێد بۆ چیاد و خاتوون گریا، جارێکی دیکە گەڕایەوە بۆ لاپەڕە هەڵنەدراوەکانی یاداشتنامەکەی چیاد.

١٣- ٢- ١٩٨٩

ڕەنگە ئەمە دوا لاپەڕەی یاداشتنامەکەم بێت، چونکە دوای ئەم نووسینە دەبێت بچم بۆ لای ئومێد ڕەشپۆش. کاتژمێر (١٢)ی نیوەڕۆ یەکدی بینینمان لە غاباتی کورانە، پێم گوتووە بۆ کاری پێویست دەبێت بتبینم، ئەویش متمانەی بە منە.

من لای ئەو عەباس ئەلسوڵتانیم و سەربازی

حکوومەت و دژی حیزبی بەعسم، بۆیە ئەو متمانەی تەواوم پێ دەکات، بۆ ئەم دیدارەش ئامادەیە، ئەو نازانێت من بۆ کوشتنی ئەو ڕاسپێردراوم و ئەمڕۆ دەبێت بیکەمە قوربانی چەند گوللەیەك.

من بە دەروونێکی ڕووخاوەوە بۆ ئەم دیدارە نەفرەتییە دەچم، بۆ نەمانی مرۆڤێك دەچم، کە منی فێری خوێندنەوەی قووڵ و سوودبەخش کردووە و سەدان کتێبی دانسقەی بۆ پەیدا کردووم، بە هۆی ئەوەوە توانیم بیر بکەمەوە و لە کەسێکی نەخوێندەوار خۆم جیا بکەمەوە.

ئاخر ئەم کتێبانەی ئەو بۆی پەیدا دەکردم و بۆی هەڵدەبژاردم وایانلێکردم من بە پێچەوانەی ڕاسپاردن و ئەرکی ئەمنیم ڕەوتار بکەم، ئەوەتا وا بۆ ئەم دیدارە دەچم پێش ئەوەی ڕکم لەو بێت، واملێهاتووە ڕکم لە خۆمە.

لەبەرئەوەی چەند ڕۆژێکە عومیشەی خۆشەویستم کۆچی دوایی کردووە، هێشتاکە پرسەبارم و زۆر خەمباری ئەوم، دوای ئەویش ژیان بۆ من هیچ واتایەك ناگەیێنێت و مانەوەیەکی تێدا نەماوە،و ئەستەمیشە بتوانم دوای ئەو لە ژیاندا بەردەوام بم.

وا خۆم بۆ ئەم دیدارە ئامادە کردووە، بەلام لە هزراندا ئەم بیرۆکەیە تەواو خۆی بەسەر هۆشمدا

چەسپاندووە، کە لەجیاتی ئومێد ڕەشپۆش، من ببمە قوربانی و جەلـلاد و قوربانییەکە هەر خۆم بم و ئومێد ڕزگار بکەم، هەر خۆشم بکوژ و کوژراوەکە بم، بەمەش ویژدانم ئاسوودە دەبێت و لە تاوانێکیش خۆم ڕزگار دەکەم، کە قوربانییەکە شایستەی نییە، هەمیش لە دنیاکەی ئەودیودا بە خۆشەویستەکەم شاد دەبمەوە.

* * *

ئومێد لەو دەمەدا کە ئەو لاپەڕەی خوێندەوە، ڕاستگۆیی و وەفاداری چیادی بۆ پشتڕاست بووەوە و پەیامی ئەدەب و ڕۆشنبیری و هێزی مەعریفەی بۆ دەرکەوت لە گۆڕینی هزری مرۆڤەکاندا، بۆیە لە دڵی خۆیدا فاتیحا و قولوەڵایەکی بۆ خوێند و ڕەحمەتی بۆ نارد، ڤێجا بیری لەوە کردەوە، کە دەبێت ئەویش بە هەمان شێوە بۆ خۆشەویستەکەی ئەمەکدار بێت، ئیتر ئەویش وەك چۆن چیاد نەیتوانی دوای عومیشە لە ژیان بەردەوام بێت، ئەویش بە هەمان شێوە، ئەگەر لە ژیاندا بمێنێتەوە هەر ڕۆژێك و کاتژمێرێك و چرکەیەك بۆ ئەو مردنێکە، دوای خاتوونیش ژیان بۆ ئەو پڕ ئازارە و ناتوانێت چیتر بەرگەی مانەوەی بگرێت.

تا دێت ئەو ئازارە چرکە دوای چرکە بە سوێتر دەبێت و لە کاری بەرگەگرتن چووەتەدەر، ئیدی شریتی یادەوەرییە ژیانەژێنەکان و ویژدانەژێنەکان پچڕا و کاتژمێریشی بوو بە سفر و وێستا.

مێشك و هزری ئومێد لە یەك چرکەساتدا، هەزاران تەزوو و برووسکە و مووچڕك بە هەموو گیانیدا شۆڕبوووەوە و لە بیرکردنەوە دایانبڕی، بۆیە بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات لە دیواری سەربانەکە نێزیك بووەوە و بەسەریدا هەڵگەڕا و تاکە دیمەن لە مێشکی ئەودا بێت تەنیا بەژن و باڵای خاتوون بوو،

که له باخێکی بەهەشتدا بوو، چەپکە گوڵێکی بۆنخۆش و جوانی بەدەستەوە بوو، ئامێزی خۆی بۆ والآکرد و هەرچەندە پڕ بە دەمی گازی دەکرد، ئەو هیچی نەدەژنەوت، وەلێ بە دڵخۆشییەوە پێنگاڤانی بۆ لای ئەو هاوێشت.

هەر هێندەی لە تۆمارگەی مێشکیدا هەستی پێکرد، لەگەڵ کەوتنی بۆ سەر زەوی، چەپکە گوڵەکەی دەستی خاتوون هەڵوەری و نەیتوانی بۆنی بکات.

*  *  *

تۆی خوێنەریش بەشدارێکی ئەم ڕۆمانەی، بۆیە دەتوانیت بە ویستی خۆت کۆتاییەکەی لە هزری خۆتدا بئافرێنی.

## چاپکراوەکانی نووسەر

١- (( ؟ )) شەش کورتە چیرۆکی کوردی، بە هاوبەشی لەگەڵ کەمال سەعدی، هەولێر، چاپخانەی شارەوانی، چاپی یەکەم، ١٩٧٦، ٣٥ ل.

٢- خەونە سەوزەکان، چیرۆك، بەغدا، چاپخانەی ئۆفسێتی حسام، چاپی یەکەم، ١٩٨٨، ٨٠ ل.

٣- مەرگی بازنەیی، نۆڤلێت، لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی ڕۆشنبیرانی نوێخواز ژمارە (٦)، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ١٩٩٩، ٤٨ ل.

٤- بیبلیۆگرافیای چوار ساڵەی گۆڤاری (ڕامان)، بە هاوبەشی لەگەڵ عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری (ڕامان)، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٠، ٤١٢ ل.

٥- پێناسەی دەستوور، یاسایی، د. عەبدولڕەزا ئەلتەعان، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری یاسایی ژمارە (١٢)، هەولێر، چاپخانەی کەوێڵ، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤، ٤٨ ل.

٦- دەروازەیەك بۆ هزرنامەی لویس ئەلتۆسێر، هزر، ئۆجیلفی، وەرگێڕان لە عەرەبییەوە، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای سەردەم- کتێبی گیرفان ژمارە (٥٤)، سلێمانی،

چاپخانەی دەزگای سەردەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٤، ٩٤ ل.
٧- تاوانباری جەنگ، یاسایی، لە بڵاوکراوەکانی یەکێتی مافپەروەرانی کوردستان ژمارە (٥)، هەولێر، چاپخانەی منارە، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، ٩٦ ل.
٨- چیرۆکی کوردی - ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری - کتێبی گیرفان ژمارە (٧)، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، ٩٦ ل.
٩- ئاوێنە، ١٠٠ کورتیلە چیرۆك، لە بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران- هەولێر ژمارە (٥٥)، سلێمانی چاپخانەی گەنج، چاپی یەکەم، ٢٠٠٥، ٨٠ ل.
١٠- ڕۆمانی کوردی- خوێندنەوە و پرسیار، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ژمارە (٥٢٩)، هەولێر، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧، ٣٦٠ ل.
١١- گیای سەروەری، چیرۆك، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری ژمارە (٢٩٨)، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، ٩٤ ل.
١٢- پەیژەکانی تاریکی، کۆچیرۆك، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس ژمارە (٨٢٩)، هەولێر، چاپخانەی دەزگای ئاراس، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، ٢٥٥ ل.
١٣- چیرۆکی کوردی- ڕەخنە و لێکۆڵینەوە، بە دەستکاری و زیادکردنەوە، لە بڵاوکراوەکانی

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە ژمارە (٢١٧)، هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، چاپی دووەم، ٢٠١٦، ١٦٤ ل.
١٤- ئاوێنە، ١٠٠ کورتیلە چیرۆك، بە زیادکردنی لێدوان و نووسینەکان لەبارەی کورتیلە چیرۆکەکان و وەرگێڕانی کورتیلە چیرۆکەکان بە زمانی عەرەبی و تورکمانی- ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی دووەم، ٢٠١٦، ٢٧٢ ل.
١٥- دەسەڵاتی ڕۆشنبیری، بابەتی ڕۆشنبیری و سیاسی و یاسایی- ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، ٢٠١٦، ٣٤٤ ل.
١٦- شیری مووسا، ڕۆمان، لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ژمارە (٨٦٤)، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەکەم، ٢٠١٧، ١٩٢ ل.
١٧- کوێرەی چاوساغ، ڕۆمان، ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم، ٢٠١٨، ١٠٤ ل.
١٨- سەدرەدین عارف نوێکاری چیرۆکی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ژمارە (٨٥٨)، سلێمانی، چاپخانەی دەزگای سەردەم، چاپی یەکەم، ٢٠١٨، ١١٨ ل.
١٩- ئینسکلۆپیدیای لەتیف حامید بەرزنجی نوێکاری چیرۆکی کوردی، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای

کوردی ژماره (٣٤٦)، هەولێر، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، چاپی یەکەم ٢٠١٨، ٧٠٠ ل.
٢٠- شمشێری مووسا، ڕۆمان، ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی دووەم، ٢٠١٩، ٢٨٢ ل.
٢١- دڵشاد مەریوانی نوێکاری چیرۆکی کوردی، لێکۆڵینەوەو دەقی ئەو چیرۆکانەی لە کۆبەرهەمەکەیدا نین لەگەڵ دراماکانی، ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی یەکەم ٢٠١٩، ٢٠٨ل.
٢٢- کوێرەی چاوساغ، ڕۆمان، ئێران، چاپخانەی تاران، چاپی دووەم ٢٠١٩، ١٩٤ ل.



## سابیر ڕەشید ساڵح

- ساڵی ١٩٥٦ لە شەقڵاوە-هەولێر لە دایك بووە.
- قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە.
- ساڵی ١٩٨١ کۆلیژی یاسا و ڕامیاری لە زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ساڵی ٢٠٠٤ وەك فەرمانبەر لە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکوومەتی هەرێم دامەزراوە.
- ساڵی ٢٠١٩ خانەنشین بووە.
- سەرنووسەری گۆڤاری (مەم) بووە کە دوای ڕاپەڕین لە شەقڵاوە دەرچووە.
- دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (دەنگارە) بووە کە دوای ڕاپەڕین لە شەقڵاوە دەرچووە.
- بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (هەرێم) بووە کە وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوانی حکوومەتی هەرێم دەریکردووە.
- بەڕێوەبەری نووسینی گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) بووە کە وەزارەتی ڕۆشنبیری حکوومەتی هەرێم دەریکردووە تا گۆڤارەکە وەستاوە.

- لە ساڵی (١٩٧٤)ەوە دەستی بە نووسین و بڵاوکردنەوە کردووە.
- بۆ ماوەی خولێك دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (نووسەری نوێ) بووە کە یەکێتی نووسەرانی کورد، لقی هەولێر دەریکردووە.
- (٢٢) کتێبی چاپکراوی هەیە لە بوارەکانی: ڕەخنەی ئەدەبی و چیرۆك و ڕۆمان و نۆڤلێت و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی و وەرگێڕان.
- چەندین کتێبی جۆراوجۆری ئەدەبی ئامادەیە بۆ چاپ.
- لە زۆربەی گۆڤار و ڕۆژنامەکانی کوردی و عەرەبی بە زمانی کوردی و عەرەبی بابەتی بڵاوکردۆتەوە.
- چیرۆك و بەرهەمەکانی بۆ چەند زمانێك وەرگێڕدراون.
- ئێستەکە لە هەولێری دەژی و خەریکی کاری بازرگانییە و دووکانەکەی بۆتە شوێنی نووسەر و هونەرمەند و ڕۆشنبیران و ناویان لە دووکانەکە ناوە (هزرخانە).